بنکەی توێژینەوە (6)

# عەرەبە ئەفغانیەکان

## چیرۆکی دروستبوونی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە



Afghans

سەرمەد ئەحمەد

# عەرەبە ئەفغانیەکان

## چیرۆکی دروستبوونی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە

سەرمەد ئەحمەد

هەولێر - ٢٠٠٦

ناوی کتێب: عەرەبە ئەفغانیەکان

- نووسینی: سەرمەد ئەحمەد
- نەخشەسازی ناوەوە: هەردی
- بەرگ: رێبین
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: ( ٨٦٦ )
- تیراژ: ١٥٠٠ دانە
- چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- نرخ: ٢٥٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب ( ٧ )

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
www.mukiryani.com
asokareem@ maktoob.com
Tel: 2260311

# پێشەکی

ئەم تۆیژینەوەیە، هەندەی مەبەستی خستنەڕوویکی زانستیانەی بابەتێکی سیاسی – ئایینیی بووە، هەندە مەبەستی نەبووە دیدێکی پێشوەختە بداتە خوێنەر، بۆیە زۆر هەوڵدراوە لە بەکارهێنانی سەرچاوەکان و کەسایەتییەکان لە ئەسڵی دەقەکان نزیك ببێتەوە، هەر ئەو زمانەش بەکاربێنێ کە لەو سەرچاوانەدا بەکارهاتوون، ئەمەش بۆ ئەوەی پارێزگاری لە ناوەڕۆکە بابەتی و زانستییەکەی بکرێت.

لەوانەیە لێکۆڵینەوە لە دیاردەیەکی سیاسی وەك (قاعیدە) کە هێشتا لە دروستبوونەوەدایە، لەلایەکی دیکەوە کارکردو مەوداکانی لە دیاردەیەکی سیاسی دەترازێ و تێکەڵاوی مەسەلەی عەقیدەیی و ئایینی دەبێ، کارەکە ئاڵۆزتر دەکات، ئەمە سەرەڕای بەکارهێنانی چەمك و دەستەواژەکان بۆ بابەتێکی تێکەڵاو لەوانەیە هەندێ گرفتی تێگەیشتن دروست بکات، بۆ رزگاربوون لەم گرفتەش چەندی توانرابێت ئەو چەمکانە لە سەرچاوە سەرەکییەکەی خۆی بەکارهێنراوە، بۆ نموونە (جیهاد، کوفر، وەلا و بەرا، ئەمیر، زەعیم، موسوڵمان، جەماعە......هتد)، لەلایەکی دیکەوە چەمکی وەك (تیرۆرست و چەکدار لە شوێنی موجاهد و، کوژراو لە شوێنی شەهیدبوون) بەکارهاتووە، ئەمەش لەبەرئەوەی سەرچاوەکە بەم ناوهێنانە باسی کردووە، خوێنەر لە خوێندنەوەی نووسینەکە لەمە تێدەگات، چونکە لە باسکردنی قاعیدە، هەم سەرچاوەی ئیسلامی و هەم دەزگای هەواڵگری ئەمریکی بەکارهاتوون.

تێگەیشتن لە دیاردەیەکی وەك قاعیدە کە لە جوغزی ئایین سیاسەت کاردەکات واڵە توێژەر دەکات ئەولاتر لە مەسەلەی سیاسی بچێ و ئاگادارییەکی باشی لە عەقائیدی ئایینی موسڵمانانش هەبێ، هەرچەندە لەمەشدا هەوڵی ئەوە نەدراوە

مەسەلە خیلافیە شەرعیەکانی نێوان لایەنە ئیسلامیەکان یەکلایی بکاتەوە، ئەوەندە نەبێ ئاماژە بە هەندێ لەو خیلافانە دراوە.

بۆ ئەوەی خوێنەر لە سەرەتای ڕووداوەکان ئاگادار بێت، دەستپێکێك بۆ ئەم نووسینە دانراوە، بە تایبەت مێژووچەیەك لە ڕووداوە سیاسیەکانی ئەفغانستان، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو هەرێمە هەروەك سەرانی ئەلقاعیدە باسیان کردووە، زەمینەیەکی لەبار بووە بۆ دروستبوونی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە.

ئەم نووسینە لە هەشت بەش پێکهاتووە، بە شێوەیەکی وا کە خوێنەر هەر لە سەرەتاوە ئاگاداری ڕووداوەکان دەکات، ئەمەش وایکردووە:

- بەشی یەکەم: بە ناساندنێکی سەرانی هەرە دیاری قاعیدە (عەزام، ئوسامە، زەواهیری) دەست پێبکەین.

- بەشی دووەم: باسی ڕەوشی سیاسی ئەفغانستان کراوە، لە

- بەشی سێیەم: دیاردەی ئەفغانی عەرەب کە کرۆکی بابەتەکەیە باسکراوە، ئەمەش گرنگترین بەشی ئەم کتێبەیە.

- بەشی چوارەم: بیرکردنەوەی ئەفغانە عەرەبەکان باسکراوە، ئەمەش بابەتێکی فیکری و عەقائیدی و سیاسی لە خۆدەگرێت، لێرەدا ئەو هێڵە فیکری و سیاسیانەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ڕێکخراوی ئەلقاعیدە لە باقی ڕێکخراوە ئیسلامیەکانی دیکە جودا دەکاتەوە.

- بەشی پێنجەم: کە تەرخانکراوە بۆ باسکردنی دامەزراندنی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە، ئەگەرچی دامەزراندنی چەند قۆناغێکی جیاجیای بینیوە، بەڵام زۆربەی بۆچوونەکان لە سەر ئەمە کۆکن کە دامەزراندنی ڕێکخراوی ئەلقاعدە دەگەڕێتەوە بۆ سالچی ١٩٩٨ کاتێ سەرانی ئەم ڕێکخراوە جاڕی بەرەی جیهانی ئیسلامی یان دژ بە ئەمرکا و جولەکەدا. لەم بەشەدا لق و پۆپی ڕێکخستنەکانی ڕێکخراوی ئەلقاعدە بە ووردی باسکراوە، بەڵام زۆر گرینگی بەو ڕێکخستنانە نەدراوە کەلە هەرێمەکەمانەوە دوورن وەك ئەوروپا و ئەمریکا.

- بەشی شەشەم: بۆ باسکردنی چالاکیە سەربازی و پرۆژە وەبەرهێنەکانی ئەلقاعیدە تەرخانکراوە، ئێمە لە هەڵبژاردنی ئەو وڵاتانەی کە رێکخراوی ئەلقاعیدە چالاکی تێدات نواندووە، نزیکی لە هەرێمەکەمان و کارکردی سیاسیمان لەبەرچاو گرتووە، چونکە باسی ئەمریکاشمان کردووە، کەچی لێمانەوە دوورە، بەڵام لەبەر ئەوەی کارردی سیاسی ئەمریکا بەرەی دژە تیرۆر لە * هەرێمەکەی ئێمە هیندەزۆژە ناکرێت لەم دیاردەیە بگەین بە بێ ئەوەی رابردووی ئەو پەیوەندییە سیاسییانەی ئەو رێکخراوە نەزانین. هەندێ وڵاتی دیکەش وەك (ئوردن و لوبنان و سوریا و فەلەستین) لە کاتی نووسینی ئەم کتێبەدا رێکخراوی ئەلقاعیدە ئەوەندە چالاکی تییاندا نەدەنواند، بەڵام لێرە و لەوێ بە زۆر و کەم باسیان کراوە.

-بەشی حەوتەم: چالاکی رێکخراوی ئەلقاعیدە لە کوردستان پێش چالاکی ئەلقاعیدە لە عێراق باسکراوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی قاعیدە لە کوردستانەوە بۆ ناو هەناوی عێراق رۆیشتووە.

- بەشی هەشتەم: بۆ چالاکی ئەو رێکخراوە لە عێراق تەرخانکراوە، ئەگەرچی ئەژمارکردن و چوارچێوە دانان بۆ چالاکیەکانی ئەلقاعیدە کارێکی ئەستەمە، لەبەر ئەوەی رێکخراوی ئەلقاعیدە هێشتا بە ئەکتیڤانە چالاکی دەنوێنێ.

سەرمەد ئەحمەد

٢٠٠٦-١-١٥

## دەستپێک

دیاردەی ئەفغانە عەرەبەکان، بە مانایەکی وردتر فینۆمینێکی سیاسی وەك قاعیدە، لەسەر زەمینێك سەری هەڵداوە، کە مێژوویەکی دوورو درێژە بۆتە جێگەی ململانێی زلهێزەکانی جیهان. ئەفغانستان ئەو شوێنەیە کە دیاردەی ئەفغانە عەرەبەکانی لێ سەرهەڵدا. ئەفغانستان لانەی دروستبوونی (قاعدة الجهاد) بووە. بە پێویستی دەزانم خوێنەری ئەم توێژینەوەیە زانیارییەکی سەرەتایی لەسەر مێژووی نزیکی ئەم وڵاتە هەبێ و لەوە ئاگادار بێت کە بۆچی ئەو زەمینەیە ئەو دیاردەیەی بەرهەمهێنا، ئەو فاکتەرانە چی بوون کە بوونە هۆی گەشەسەندن و بڵاوبوونەوەی (قاعیدە) لە سەرانسەری جیهاندا.

دوای مردنی (تەیموور شا) پێشبڕکێ لە نێوان رووسیا و بەریتانیا لەسەر دەستگرتن بەسەر ئەفغانستاندا دەستپێکرد. ساڵی ١٨٠٩ بەریتانیا سەرکەوت و توانی ڕێککەوتننامەیەکی بەرگریی هاوبەش لە دژی رووسیا لەگەڵ (شا شوجا) ی کوڕی (تەیموور شا)دا مۆربکات.

ساڵی ١٨٣٨ هێزەکانی بەریتانیا بۆ پاڵپشتیکردن لە (شا شوجا) کە لەسەر کار لادرابوو، هاتنە ناو ئەفغانستانەوە. سەرەتا بەریتانییەکان کارەکەیان بەئاسان هاتە بەرچاو، بەڵام دوای دوو ساڵ، بەریتانییەکان ڕووبەڕووی بەرپەرچدانەوەیەکی توند بوونەوە، ڕەوشەکە بەرەو خراپی چوو، بۆیە بەناچاری (دۆست محمد)یان بە حاکمی کابوڵ ناساند و بەڵێنی پاشەکشەیان لە ئەفغانستان دا. ساڵی ١٨٤٠ کاتێ هێزەکانی بەریتانیا لە زستاندا دەستیان بەکشانەوە کرد، تووشی هێرشی ئەفغانەکان و سەرماو سۆڵەیەکی توند بوونەوە، لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆریان لێ فەوتا.

دوای کشانەوەی بەریتانیا، (دۆست محمد) توانی دەسەڵات بەسەر مەزارشەریف و کندۆز و پاداکشان و قەندەهاردا بگرێ، هەروەها توانی پیشاوەر و هیراتیش

بخاته ژێر ڕکێفی خۆیەوە، لەو سەردەمەدا رووسیا دەیویست ویلایەتەکانی ئاسیای ناوەڕاست بخاته ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بەڵام لەژێر فشاری بەریتانیا ڕازی بوو ڕێککەوتننامەی (هەرێمی دابڕاو) مۆربکات، ئەو هەرێمە دابڕاوەش دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەفغانستانەوە.

ساڵی ۱۸۷۹ ڕێککەوتننامەی (جاندا ماك) لە نێوان (یەعقوب خان)ی حاکمی کابوڵ و بەریتانیادا مۆرکرا. بەگوێرەی ئەو ڕێککەوتننامەیە، بەریتانیا مافی ئەوەی پێدرا، کە لە کابوڵ بمێنێتەوە و کاروباری دەرەوەی ئەفغانستان بەڕێوەببات، هەر هەمان ساڵ نوێنەری بەریتانیا گەیشتە کابوڵ، بەڵام دەستبەجێ تیرۆرکرا. لە سۆنگەی ئەمەوە هێزەکانی بەریتانیا هاتنە ناو کابوڵ و ژەنەڕاڵ (ڕۆبرست) بووە حاکمی کابوڵ. ساڵی ۱۸۸۰ (عەبدولرەحمان خان) لە (سەمەرقەند) و (تەشقەند)ەوە خۆی وەك ئەمیری ئەفغانستان ناساند.

ساڵی ۱۹۰۱ عەبدولرەحمان خان دەمرێ و کوڕە گەورەکەی، (حەبیبوڵڵا)، شوێنی دەگرێتەوە. (حەبیبوڵڵا) ڕێگەی بە پیاوانی ئایینی دا لە بواری سیاسیی ئەفغانیدا ڕۆڵی خۆیان ببینن، (حەبیبوڵڵا) توانی سەربەخۆیی ئەفغانستان و بێلایەنی لە شەڕی جیهانیی یەکەمدا بپارێزێ، لە ساڵی ۱۹۱۹ تیرۆر کراو کوڕەکەی، (ئەمانوڵڵا) جێی گرتەوە.

دوای چەند مانگێك (ئەمانوڵڵا) شەڕی دژ بە بەریتانیا جاڕدا، بەریتانیاش ئەوکات لاوازبوو، نەیدەویست شەڕی دیکە بکات، بۆیە ساڵی (۱۹۱۹) ڕێککەوتننامەی (ڕوالبەندی) لەگەڵ ئەفغانستاندا مۆر کرد و ئەفغانەکان سەربەخۆ بوون لە هەڵسوڕاندنی کاروباری سیاسی و دەرەکیدا.

ساڵی ۱۹۲۱ ڕێککەوتننامەیەکی دۆستانەی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا مۆرکرد.

(ئەمانوڵڵا) هەستی بە دواکەوتوویی گەلی ئەفغانی لە چاو ڕۆژئاوادا دەکرد، گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دەبێت گەلی ئەفغانی نوێ بکرێتەوە و بەرەوپێش ببرێت،

بۆیە ساڵی ١٩٢٨ بۆ ماوەی شەش مانگ سەردانێکی ئەوروپای کرد. دوای گەڕانەوە، جل و بەرگی ڕۆژئاوایی و خوێندنی ڕۆژئاوایی سەپاند. خەڵکی ئەفغان بە توندی بەرپەرچی ئەم کردەوانەی (ئەمانوڵڵا)یان دایەوە. لە ئەنجامدا بۆ تاراوگە ڕایکرد. دوای ئەویش کابرایەکی تاجیکی (پاشا ساقۆ) دەسەڵاتی گرتەدەست، ئەویش دوای (٩) مانگ لەلایەن (محەمەد نادر خان)ی پەشتۆنی، کە سەرکردەی سوپای سەردەمی (ئەمانوڵڵا) بوو، لەسەر کار لابرا. ساڵی ١٩٣٣ محمد نادر خان تیرۆر کرا و کوڕەکەی، (زاهیر شا)ی تەمەن ١٩ ساڵە، شوێنی گرتەوە. هەرچەندە ئەو شایە تەمەنی بچووك بوو، بەیارمەتی مامەکانی، بۆ ماوەی (٤٠) ساڵ حوکمی کرد.

لە ماوەی شەڕی دووەمی جیهاندا، ئەفغانستان بێلایەن مایەوە. هەر لەو ماوەیەشدا بوو گفتوگۆ بۆ جودابوونەوەی پاکستان لە هیندستان بەڕێوە دەچوو. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٤٧ پاکستان لەدایکبوو.

یەکێتیی سۆڤیەت، هاوکاری ئەفغانستان بوو لەڕووی بازرگانییەوە و یارمەتی دەدا، ساڵی ١٩٥٥ سۆڤیەت (١٠٠) ملیۆن دۆلاری وەك قەرز بە ئەفغانستان دا. دوای ساڵێك چەندین بارە چەکی ڕووسی گەیشتنە ئەفغانستان، هەروەها سۆڤیەت چەند فڕۆکەخانەیەکی لە نزیك (مەزار شەریف) و (شنداد) و (باگرام) و (کابوڵ) دروستکرد.

لە ماوەی فەرمانڕەوایی (محەمد داود خان) لە ساڵانی (١٩٥٣-١٩٦٣) ئەفغانستان لەگەڵ هەریەکە لە (ئەمریکا و سۆڤیەت) نزیك بووەوە.

داود خان و گەورە بەرپرسانی حکوومەتەکەی هانی هاووڵاتیانیان دەدا، کە ئافرەتان سەرپۆش فڕێ بدەن. زیاتر ئافرەتانیان هێنایە ناو بواری کارکردن. ئەم کردەوانەی داود خان پیاوانی ئایینی بێزارکرد و چەند خۆپیشاندانێك سازکران و بەیارمەتی سوپا دامرکانەوە.

ساڵی ١٩٦١ پەیوەندی دیپلۆماسی لە نێوان ئەفغانستان و پاکستاندا پچڕا. ساڵی ١٩٦٣ داود خان دەستی لەکار کێشایەوە. پاکستان ڕازی نەبوو نەوت بە

ئەفغانستان بدات، ئەمەش وایکرد پەیوەندی ئەفغانستان لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا پتەوتر بێت، لەبەرانبەریشدا یەکێتیی سۆڤیەت بەرهەمە نەوتییەکان و شمەکی پێوستی بە ئەفغانستان دەداو خوری و لۆکەی ئەفغانی دەبرد.

ساڵی ١٩٦٤ یەکسەر دوای دەست لەکارکێشانەوەی داودخان، زاهیر شا دەستوورێکی بۆ وڵات دانا. لە دەستوورەکەدا یەکسانی نێوان ژن و پیاو، هەڵبژاردن و دامەزراندنی پەرلەمان چەسپێنرا، ساڵی ١٩٦٥ یەکەم پەرلەمانی ئەفغانی هەڵبژێردرا کە لە کۆی (٢١٦) ئەندام، چوار ژنی تێدابوو.

کردنەوەی قوتابخانە و زانکۆ لە کابوڵی پایتەخت وایکرد لە کۆتایی شەستەکاندا ژمارەیەکی زۆر لە قوتابی بەمەبەستی خوێندن ڕوو لە کابوڵ بکەن و تێکەڵاوی بزووتنەوە ڕادیکاڵییەکانی نێو قوتابیان بن، ئەوانە داوای پەلەکردنی زیاتری چاکسازییان دەکرد. حزبی گەلی دیموکراتی لەمەدا پاڵپشتی دەکردن. لەبەرانبەردا کەسانێکیش هەبوون، دژایەتی ئەو چاکسازییانەیان دەکرد و داوای گەڕانەوەی بەها ئیسلامییەکانیان دەکرد.

لە سەرەتای حەفتاکاندا، چەند پارتێکی ئیسلامی دروستبوون، کە داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامییان دەکرد لەسەر بنەمای شەریعەتی ئیسلامی. نەوەکانی (ئۆزبەگ و تاجیك)، ئەوانەی لە ترسی چەوساندنەوەی ئایینی سۆڤیەت هاتبوونە باکووری ئەفغان، چوونە نێو ریزەکانی ئەو پارتە ئیسلامییانەوە.

سەرۆك وەزیران (داود خان) ساڵی ١٩٧٣ (زاهیر شا)ی لە دەسەڵات لابرد و پارتە ئیسلامییەکانی لە فەرمانڕەوایی دوور خستەوە، کە زۆربەیان ناچاربوون بەرەو پاکستان بچن، داود خان ڕووی لە یەکێتیی سۆڤیەت بۆ لای ئەمریکا وەرگێڕا.

لە ١٩٧٨/٤/١٧دا پارتی گەلی دیموکراتی ئەفغانی بە یارمەتی یەکێتیی سۆڤیەت کودەتایەکی سەربازی ئەنجامدا و (داود خان) تیاچوو. حکوومەتی نوێ ویستی چەند ریفۆرمێکی لە شێوەی (فێرکردن و چاککردنی زەوی کشتوکاڵی،

دیاریکردنی تەمەنی هاوسەر گرتن...) بکات، بەڵام داب و نەریتی خەڵکی ئەفغان و مەسەلەی ئایینی ڕێگربوون لەبەردەم ئەو چاکسازییانەدا. باری وڵات بەهۆی برسێتییەوە شپرزەبوو. لێرە و لەوێ کاری گێرەشێوێنی دەستی پێکرد، سوپا ڕووبەڕووی خەڵك بووەوە. دەنگی جیهاد دژ بە حکوومەت لە هەموو لایەك بەرز بووەوە، توندوتیژی سوپا بەرانبەر خەڵك وایکرد کۆچی بەکۆمەڵ دروست ببێ.

لە مانگی ١٢ی ساڵی ١٩٧٨ دا ڕێککەوتنێك لە نێوان پارتی گەلی دیموکراتی فەرمانڕەوا و یەکێتیی سۆڤیەتدا مۆرکرا، کە بەهۆیەوە سوپای سوور مافی ئەوەی دەبێت بێتە ناو خاکی ئەفغانستان، ئەگەر حکوومەتی ئەفغانی ئەو داوایە بکات.

لە مانگی ٩ی ساڵی ١٩٧٩ حکوومەتەکەی (نور محەمەد تراکی) لەسەر کار لابرا و دواتر تیرۆرکرا، سەرۆك (حفیظ الله امین) لە شوێنی دانرا.

لە دیسێمبەری ساڵی ١٩٧٩دا یەکێتیی سۆڤیەت ئەفغانستانی داگیرکرد. ئەمەش هۆکاری داگیرکاریەکەیە:

١- مۆسکۆ لەوە دەترسا لە باشووری وڵاتەکەی (واتە لە ئەفغانستان)ەوە لەلایەن ئەمریکاوە دەورە بدرێت.

٢- ئەمریکا دەستی بەیارمەتیدانی پارتە ئیسلامییەکان کردبوو.

٣- سۆڤیەت لەوە دەترسا ئەمریکا، ئەفغانستان وەك بنکەیەکی سەربازی بەکاربهێنێت.

٤- ئەوکاتە نزیکبوونەوەیەك لە نێوان ئەمریکا و چیندا هەبوو.

٥- شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران و کارکردەکانی.

لەگەڵ داگیرکاری سۆڤیەت، سەرۆك (حفیظ الله امین) تیرۆرکرا و (بابراك کارمل) لە مۆسکۆوە وەك سەرۆك دامەزرا.

داگیرکاریی سۆڤیەت بۆ ئەفغانستان لە ساڵی ١٩٧٩ تاکو ١٩٨٩ی خایاند. ئەو ماوەیە، بۆ ئەم توێژینەوەیە ئەوەندە گرنگە، بۆیە بەباشمزانی پێشینەیەکی ئەو ماوەیە لێرەدا باس بکەم، تەواو ڕووداوەکانی ئەم توێژینەوەیە لەگەڵ ساڵی ١٩٧٩ بەداگیرکاریی سۆڤیەت بۆ ئەفغانستان دەست پێدەکات.

لە ڕاستیدا پێگەی پارتە ئیسلامییە ئەفغانییەکان لە دەسەڵاتی ئەفغانستان زۆر قایم نەبوو، بەتایبەت لە سەردەمی پێش پرۆسەی داگیرکردنەکە، بەڵام بەهۆی ئەو ئازارانەی ئەفغانەکان بەدەستی هێزە داگیرکەرە ڕووسەکانەوە بینیان ژمارەیەکی یەکجار زۆریان ئاوارەی وڵاتانی دراوسێ بوون. ٣،٢ ملیۆن ئەفغانی پەنایان بۆ پاکستان برد، ٢،٩ ملیۆنیش بۆ ئێران. هەریەکە لەم دوو دەوڵەتەش (ئێران و پاکستان) ڕێگەیان بە چەکدارانی ئۆپۆزسیۆن دەدا کە لە خاکەکەیانەوە هێرش بۆ سەر حکوومەتی ئەفغانی لایەنگری سۆڤیەت ببەن.

لێرەوەیە ناوی (موجاهیدانی ئەفغانی) بەدەردەکەوێت، بەتایبەتی دوای ئەوەی بزووتنەوەی بەرگری ئەفغانی (المقاومة الافغانية) دامەزرا. حکوومەتی پاکستان بە سەرۆکایەتیی (ذوالفقار علي بوتو) ڕێگەی بەوانەدا لە پیشاوەر نووسینگە بکەنەوە، بەپارە و چەکیش یارمەتیدان.

دوای لە سێدارەدانی (ذوالفقار علي بوتو) پارتە ئیسلامییە ئەفغانییەکان زیاتر بوژانەوە، چونکە سەرۆکی تازە (ضياء الحق) لەڕووی ئایدیۆلۆژییەوە زیاتر لە پارتە ئیسلامییەکان نزیك بوو.

(ضياء الحق) دەیویست حکوومەتێکی ئەفغانی لایەنگیری خۆی لە ئەفغانستان دابمەزرێ و هاوپەیمانیەتییەکی ئیسلامی هەر لە پاکستانەوە تاکو ناوەڕاستی ئاسیا پێکبهێنێ، بۆ ئەوەی بتوانێ ڕووبەڕووی هیندستان ببێتەوە.

ساڵی ١٩٧٩ بڕیاریدا یارمەتی ئیسلامییە ئەفغانییەکان بدات. لە ساڵی ١٩٨٦ دا ئەو یارمەتییانە زیادی کرد، ئەمریکاش لە ڕێگەی پاکستانەوە یارمەتی پێشکەش دەکرد، بۆیە لەو ماوەیەدا چەندین پارتی ئیسلامی ئەفغانی

دروستبوون و داوای یارمەتیان لە پاکستان دەکرد، بەلاّم حکوومەتی پاکستان تەنها دانی بە (٧) پارتی سەرەکی ئەفغانی دادەنا، ئەوانیش:

١- کۆمەڵی ئیسلامی (الجماعة الاسلامیة): ساڵی ١٩٧٢ بە سەرۆکایەتیی (برهان الدین ربانی) دامەزرا.

٢- حزبی ئیسلامی: لە ئینشیقاقی ساڵی ١٩٧٩ ی پارتی (الجماعة الاسلامیة) دروست بوو، (قلب الدین حکمتیار) سەرۆکایەتی دەکرد.

٣- الحزب الاسلامی خالص: لە ئینشیقاقی ١٩٧٩ بە سەرۆکایەتیی (یونس خالص) دامەزرا.

٤- یەکگرتووی ئیسلامی (الاتحاد الاسلامی): ساڵی ١٩٧٩ لە پاکستان لەلایەن (عبدالرسول سیاف) دایمەزراند.

٥- جبهة التحریر الوطنیة الافغانیة:- ساڵی ١٩٨٠ (صبغه الله مجددی) دایمەزراند.

٦- حرکة الانقلاب الاسلامی: ساڵی ١٩٨٠ بە سەرۆکایەتی (نبی مهدی) دامەزرا.

٧- المجاز الملي الاسلامی: بە سەرۆکایەتی (پیر گەیلانی) دامەزرا.

لە ساڵی ١٩٨٥ ئەو (٧) پارتە، کە هەموویان سوننە مەزهەب بوون، هاوپەیمانێتییەکیان بەسەرپەرشتی پاکستان دروستکرد.

**کەسایەتییە دیارەکانی گۆڕەپانی ئەفغانی ئەمانە بوون:**

١- برهان الدین ربانی: ساڵی ١٩٧٢ پارتی (الجماعة الاسلامیة)ی دامەزراند. وەك مامۆستای زانکۆ لە زانکۆی کابوڵ وانەبێژ بوو. ڕەبانی کاریگەر بوو بە بیروڕاکانی بزووتنەوەی (الاخوان المسلمین)ی میسر. ڕەبانی لە ڕێگەی حزبەکەیەوە دەیویست سیاسەتێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و دادوەری لەسەر بنەمای ئیسلام پیادە بکات، پلەو پایەی مامۆستایەتی و شارەزایی ئەکادیمی، کاریگەریی زۆر

بوو لەسەر کۆکردنەوەی لایەنگر بۆ پارتەکەی. ڕەبانی سەر بە میللەتی (تاجیك)ە کە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەفغانستاندا دەژین.

٢- ئەحمەد شاه مەسعود: کاتێ قوتابی کۆلێژی ئەندازە بوو لە زانکۆی کابوڵ، چووە ڕیزی (الجماعة الاسلامیة)ەوە. مەسعود، ڕۆڵێکی بەرچاوی لە بەرگریکردن لە دژی سوپای سۆڤیەت لە دۆڵی (بانگشیر) لە باکووری ڕۆژهەڵاتی کابوڵ گێڕاوە، هەر لەو دۆڵە شاری بەڕێوەبردووە. ساڵی ١٩٩٢ کاتێ حکوومەتی کابوڵ ڕووخا بەرپرسیارێتی بەرگری و پۆلیسی پایتەختی لە ئەستۆ گرت. ئەویش (تاجیك) بوو. لە پێش لێدانی حکوومەتی تالیبان تیرۆر کرا.

٣- قلب الدین حکمتیار: ساڵی ١٩٧٩ لە (الجماعة الاسلامیة) جودا دەبێتەوەو (الحزب الاسلامی) دادەمەزرێنێ، ئەویش قوتابی کۆلێژی ئەندازەی زانکۆی کابوڵ بوو. سەر بە نەتەوەی (پەشتۆن)ە. حکمتیار پارتەکەی لە شێوەی پارتی کۆمۆنیست ڕێکخست، کە لە شانەوە دەست پێدەکات و بە شێوەی قوچەك (هرم) کۆتایی دێت. سەرکردەی پارتەکەی بەوردی هەڵبژارد، لەناو ئەفغانستاندا بنکەیەکی جەماوەری وای نەبوو، بەڵکو پشتی بە خێوەتگای پەنابەرانی ویلایەتی (ناچارها) دەبەست. لە پارتەکەی ئەودا، گەنجی خوێندەوار زۆر بوون.

٤- یونس خالص: ساڵی ١٩٧٩ لە (الجماعة الاسلامیة) جودا دەبێتەوە و (الحزب الاسلامی خالص) دادەمەزرێنێ. خوێندنی ئایینی لە قوتابخانەی (دیوباند) لە (دەلهی) لە هیند تەواو دەکات، ئەو قوتابخانەیەی کە زۆرێك لە زانایانی ئایینی ئەفغانی پێگەیاندووە. بۆ کارکردن (سەرۆکایەتیکردن) پشتی بە ڕژێمی خێڵەکی دەبەست. دەنگۆی ئەوەی لەسەرە کە بەهاندانی (مەلا محمد عمر)ی سەرۆکی بزووتنەوەی تالیبان چوبێتە ناو (الحزب الاسلامیة)وە.

٥- عبدالرسول سیاف: سەرۆکی پارتی (الاتحاد الاسلامي) بوو. سەیاف وانەبێژی ئایینی بوو لە زانکۆی کابوڵ. بەڕەوانی بە زمانی عەرەبی قسەی دەکرد. لە سەرەتای دروستبوونی (الحرکة الاسلامیة) وەك جێگری (ڕەبانی)

کاریدەکرد. ساڵی ۱۹۷۸ زیندانی دەکرێت و دوای داگیرکاریی سۆڤیەت ئازاد دەکرێ و بۆ پاکستان ڕادەکات. پارتەکەی پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ سعودیەدا هەبوو. یارمەتی ماددی لە سعودیە وەردەگرت، ئەمەش لەبەرئەوەی هەردوولا لەڕووی ئایدیۆلۆژییەوە (واتە وەهابی بوون) لەیەك نزیك بوون، بۆیە بە توندی دژایەتی کەمینە شیعەکانیان دەکرد.

٦- صبغه الله مجددی: ساڵی ۱۹۸۰ (جبهة التحرير الوطنية الافغانية) دادەمەزرێنێ. پارتەکەی بێ ئایدیۆلۆژیا بوو. زۆربەی لایەنگرانی گوندنشین بوون. خۆی لە نەتەوە (پشتۆن)ە و لە خانەوادەیەکی کۆنەپارێزە، یەکێك بوو لەوانەی داوای گەڕانەوەی (زاهیر شا)یان دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی چالاك بوو لە نێوەندە ئیسلامییە ڕادیکاڵەکاندا، بەتایبەتی لە نێوان (۱۹٥۰-۱۹٦۰) پەیوەندی بە (جماعة الاخوان المسلمين)ەوە هەبوو. سەردەمی (داود خان) بۆ ماوەی چوار ساڵ و نیو دەستگیر دەکرێت، ئەمەش لەبەرئەوەی نارەزایەتی لەو سەردانەی سەرۆکی سۆڤیەت (خرۆشۆف) بۆ ئەفغانستان دەربڕی، پارتەکەی شانسی وەبەرکەوتنی یارمەتییە سەربازییەکانی نەبوو کە پێشکەش بە موجاهیدان دەکرا.

٧- نبی مهدی: ساڵی ۱۹۸۰ (حركة الانقلاب الاسلامی) بە پاڵپشتی زانایانی ئایینی و مەلاکان دامەزراند.

٨- پیر گەیلانی:- سەرۆکێکی ئایینی بوو. پەیوەندی بە کۆمەڵە (سۆفییەکانەوە) هەبوو. سەر بە هۆزی (پەشتۆنە) و لایەنگری (زاهیر شا) بوو. گەیلانی بە بیروڕا میانڕەو و لیبڕاڵ بوو.

# بەشی یەکەم

## داهێنەرانی دیاردەی ئەفغانی عەرەب

پێم باش بوو، ئەم بەشە پێشەکی بێت، وەك دەروازەیەك بۆ ئەم توێژینەوەیە، چونکە دامەزرێنەرانی ئەم دیاردەیە لە هەموو بەشەکانی دیکەی ئەم توێژینەوەیە ناویان چەند جار دووبارە دەبێتەوە و لە زۆر شوێندا ئاماژەیان پێ دەکرێت. ناساندنیان یارمەتیمان دەدات لە نیاز و کردە و ڕەفتاریان بگەین. ئەو سێ کەسەی کە ڕۆڵی دیار و بەرچاویان لە دروستکردن و بەرەوپێشبردنی دیاردەی (ئەفغانی عەرەب - قاعیدە) هەبووە، لەگەڵ هەموو ڕووداوەکان و کەسایەتییەکانی دیکەی نێو ئەم توێژینەوەیەدا ناویان گرێ دراوە، سەروکاریان بەهەموو چالاکییەکانەوە هەیە، چونکە ئەمانە (عەبدوڵڵا عەزام، ئوسامە بن لادن، ئەیمەن زەواهیری) بیرمەند و پلاندارێژەری پلانەکان و ڕێبەری ڕۆحیی ئەفغانە عەرەبەکانن.

ئەمانە هەرسێکیان لە سەردەمێکدا خۆیان لە ئەفغانستان بینیوە، ڕووبەڕووی هەڵوێستی هاوشێوە و بیری جیهادی لەیەکچوو بوونەتەوە. بۆیە بەباشم زانی لە بەشی یەکەمدا باسی ژیان و چالاکی هەریەکەیان بکەم:

١- عەبدوڵڵا عەزام

٢- ئوسامە بن لادن

٣- ئەیمەن زەواهیری

# عەبدوڵڵا عەزام

## لەدایکبوون و ژنهێنانی

ساڵی ١٩٤١ لە فەڵەستین لە گوندی (سیلە)ی سەر بە پارێزگای (جەنین)[1] لەدایکبووە. کوڕی حاجی یوسف موستەفا عەزامە، دوای ساڵێك لە تیرۆرکردنی (عەزام) کۆچی دوایی کرد. دایکیشی ناوی (زەکیە ساڵح حسین ئەحمەد)ە، پێش ساڵێك لە تیرۆرکردنی (عەزام) کۆچی دوایی کردووە.

خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی هەر لەو گوندە تەواو کردووە، لە کۆلێژی حوزورییەی کشتوکاڵی درێژەی بە خوێندن داوە. دوای تەواوکردنی کۆلێژ بە مامۆستای سەرەتایی لە گوندی (ئەدەر) لە باشووری ئەردەن دامەزراوە.

ساڵی ١٩٦٥ ژن دێنێ و لە (دێر غەسون) لە هەرێمی تولکەرەم نیشتەجێ دەبێ[2].

دەبێتە خاوەنی پێنج کوڕ: محمد (نۆبەرە بوو لەگەڵ خۆیدا تیرۆر کرا)، حذیفة، ئیبراهیم (لەگەڵ خۆی تیرۆر کرا)، حمزە، مصعب و سێ کچ: فاطمة، وەفا و سومەیە.

## چالاکی سیاسی عەزام لە ئەردەن

دوای ئەوەی بەرەی ڕۆژئاوا لەلایەن سوپای ئیسرائیلەوە ساڵی ١٩٦٧ داگیردەکرێت، عەزام گوێ بەپاڕانەوەو کڕوزانەوەی دایکی نادات و بەرەو

---

[1] سایتی (نبض الاسلام)

[2] سایتی WWW.khayw.a.com

ڕۆژهەڵاتی ئوردن دەچێ[1]. لەوێ لەپاڵ هەندێ لاوی ئوردنی و فەلەستینی بەتایبەتی ئەوانەی سەر بە (بزووتنەوەی ئیسلامی ئوردەنی) بوون، دەستیان بە چالاکی سەربازی لە دژی ئیسرائیلییەکان، کرد[2].

عەزام لەو کاتە ئەم چالاکییانەی ئەنجام دەدا، لەباکووری ئوردن بنکەیەکی بەناوی (بنکەی شیوخ) دامەزراند و خۆی پلەی (ئەمیر)ی پێ بەخشرا.

ئەم بنکەیە لەماوەی ئەمیرایەتی عەزامدا چەند چالاکییەکی ئەنجام دا، کە عەزام خۆشی تێیدا بەشدار بوو، لەوانە[3]:

شەڕی پشتێنەی سەوز، کە عەزام لەگەڵ هاوەڵانی ئەنجامیان دا، تێیدا (ابو مصعب السوری) بریندار بوو، هەروەها شەڕی (٥)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٠.

## درێژەدان بەخوێندن

ساڵی ١٩٧٠ دوای ئەوەی سنووری نێوان ئوردن و فەلەستین داخرا، عەزام بۆ سەر کاری پێشووی گەڕایەوە و بەردەوامی بە خوێندن لە کۆلێژی شەریعە لە زانکۆی ئوردن دا،، بەمەش پلەی زۆرباشەی بەدەست هێنا. ئەمەش وایکرد کە عەزام وەك (معيد) لە کۆلێژ وانەبێژی بکات[4]. ئەمە هەلێکی باش بوو، بۆ عەزام کە سەدان لاوی زانکۆ بۆ ڕەوتی ئیسلامی سیاسی و هاندانی بۆ جیهادکردن، پەلکێش بکات. ئەم چالاکییانەی عەزام لەناو زانکۆ، وایکرد دەسەڵاتداران سنوورێك بۆ جموجوڵەکانی دابنێن و دواتر لەکارەکەی لابەرن.

---

[1] الشرق الاوسط، العدد ٩٣٣٦، سنه ٢٠٠٤.

[2] سایتی نبض الاسلام.

[3] هەمان سەرچاوە.

[4] الشرق الاوسط، العدد ٩٣٣٦، سنة ٢٠٠٤ .

هەر لەهەمان ساڵدا لە زانکۆی (ئەزهەر) نامەی دکتۆراکەی پێشکەش دەکات و ساڵی ١٩٧٣ بڕوانامەی دکتۆرا وەردەگرێت و دووبارە لە زانکۆی ئوردن دەبێتەوە وانەبێژ[1] دووبارە دام و دەزگای ئاسایش تەنگی پێ هەڵدەچنن و لە کارەکەی لادەبرێت و پەنا بۆ سعودیە دەبات.

ساڵی ١٩٨١ لە زانکۆی (شا عبدولعزیز) دەبێتە وانەبێژ، هەر هەمان ساڵ داوایەك پێشکەش بە (ڕاگر)ی کۆلێژەکە دەکات، کە ڕەوانەی زانکۆی (ئیسلامی نێودەوڵەتی) لە ئیسلام ئاباد بکرێت، تا لە خەباتی ئەفغانییەکان نزیك بێت و سەرپەرشتی ئەو عەرەبە ئەفغانانە بکات کە بۆ جیهادکردن ڕوو لە ئەفغانستان دەکەن[2].

ساڵی ١٩٨٣ بۆ سعودیە دەگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی ماوەی مانەوەی لە زانکۆی ئیسلامی نێودەوڵەتی درێژبکاتەوە، بەڵام زانکۆی جەددە لەسەر داواکارییەکەی ڕازی نەبوو. بۆیە ئەویش دەستی لەکارکێشایەوە.

## خەباتی سیاسی و سەربازی لە ئەفغانستان

لە ساڵی ١٩٨٤ دەگەڕێتەوە بۆ ئەفغانستان و (نووسینگەی خزمەتگوزاری — مکتب الخدمات) دادەمەزرێنێت[3].

ئەم نووسینگەیە (نووسینگەی خزمەتگوزاری)، زۆر چالاکی ئەنجام داوە لەوانە:

١- کۆکردنەوەی موجاهیدانی وڵاتانی عەرەب.

٢- بەسەربازکردنی ئەو لاوە عەرەبانەی بەنیازی جیهاد ڕوویان لە ئەفغانستان دەکرد.

---

[1] سایتی نبض الاسلام.

[2] الشرق الاوسط، هەمان سەرچاوە.

[3] هەمان سەرچاوە.

٣- دروستکردنی سەربازگە بۆ عەرەبە ئەفغانەکان.
٤- بازنەیەکە لە نێوان جیهانی ئیسلامی و جیهادی ئەفغانی.
٥- وتەبێژی (قسەکەر)ی جیهادی ئەفغانی بوو.
٦- هاندانی لاوانی عەرەبی و ئیسلامی بۆ جیهادکردن لە ئەفغانستان.
٧- پەڕاندنەوەی جیهادی ئەفغانی بۆ جیهادێکی جیهانی.
٨- مەشەق پێکردنی لاوەکان لە ڕووی (سەربازی و دەروونی و عەقیدەیی)یەوە.

کەواتە نووسینگەی خزمەتگوزاری دوولایەنی سەرەکی لەخۆ کۆکردۆتەوە: یەکەمیان: لایەنی ئیعلامی کە هاندان و ڕێکلامکردن و وتاردان بوو لە دەرەوەی ئەفغانستان بۆ جیهاد، دووەمیان: لایەنی کرداری کە خۆی لە مەشقی سەربازی و کۆکردنەوەی موجاهیدان و دروستکردنی سەربازگەکان دەبینیەوە.

ساڵی ١٩٨٦، عەزام یەکەم سەربازگەی بەناوی (صدا) بۆ مەشقپێکردنی لاوە هاتووەکانی ئوردن، سعودیە و میسر و ئامادەکردنیان بۆ بەرەکانی شەڕی سۆڤیەت، کردەوە. ئەم سەربازگەیە ئەوکات عەزام ناوی (نەڕەی شێری) لێنابوو کە چەند لاوێکی کەمی عەرەبی لەگەڵدا بوو. دوای ساڵێك ئەو ژمارەیە بوو بە زیاتر لە (١٠) هەزار سەربازی ئامادە بۆ جەنگ[1].

## میساقەکەی عەبدوڵڵا عەزام

ساڵی ١٩٨٧ عەزام لە نووسینی (میثاق الحرکة الاسلامیة) بووەوە. ئەم میساقە وەك پرۆگرامی هەموو پارتە ئیسلامییە سیاسییەکانی دونیا کاری پێ دەکرێت. لێرەوە جێی خۆیەتی ئاماژە بەهەندێك لایەنی ئەم میساقە بدەین.

أ- ئەم میساقەی عەزام، بزاوتی ئیسلامی بە بزووتنەوەیەکی جیهانی سەراپاگیر دادەنێت کاتێ لە ماددەی (٤) دا دەڵێ:

---

[1] هەمان سەرچاوە.

(بزووتنەوەی ئیسلامی پێشوازی لە هەموو موسوڵمانێك دەكات كە باوەڕی پێی هەبێ و ئامادەیی تێدابێ كە ئەركی خۆی لەناو بزووتنەوە دا بهێنێتەدی[1].

هەروەها لە ماددەی (٧)دا دەڵێ: (لەبەرئەوەی موسوڵمانان لە سەرانسەری دونیادا بڵاون و حەزدەكەن بزووتنەوەی ئیسلامی سەربكەوێ، بۆیە ئەم بزووتنەوەیە، بزووتنەوەیەكی جیهانییە)

ب- ئامانجی ئەو بزووتنەوە ئیسلامییەی عەزام بونیادی ناوە، بەرپەرچدانەوەی ناحەقی، پیادەكردنی ماف، گێڕانەوەی نیشتیمانی داگیركراو، دامەزراندنی دەوڵەتێكی ئیسلامی و پاڵپشتیكردنی بێهێزان و چەوساوانە[2].

ج- سەبارەت بە نیشتیمانپەروەری، عەزام لە میساقەكەدا، پێ لەسەر بەرگریكردن و ڕزگاركردنی نیشتیمان دادەگرێ و بە ئەركی سەرجەم بزووتنەوەیەكی ئیسلامی دەزانێ كە ئەم فەریزەیە جێبەجێ بكەن[3].

میساقەكەی (عەبدوڵڵا عەزام) زۆر پڕ ماددەیە. ئەگەرچی تایبەتمەندییەكی جیهانی پێوە دیارە، بەڵام لەبەرئەوەی عەزام فەلەستینیە زۆر بەزەقی جەختی لەسەر كێشەی فەلەستین و رزگاكردنی سەرجەم خاكی فەلەستین كردۆتەوە. وەك ئەو دەڵێ (فەلەستین وەقفێكی ئیسلامییە) واتا خاكێكی پیرۆزە، نەدەكرِدرێت و نەدەفرۆشرێت، نە ئەم دەست و ئەو دەستی پێ دەكرێت. ئێرە شوێنی باسكردنی سەرجەم ماددەكانی ئەو میساقە نییە. لەبەرئەوەی ئەم میساقە شمولیانەیە بۆتە هەوێنی زۆرێك لە پارتە ئیسلامییەكان.

---

[1] كتێبی (عەبدوڵڵا عەزام) نووسینی (محمد عبدالله العامر) ص١٢٧.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] هەمان سەرچاوە.

## پەیوەندیی نێوان عەزام و ئوسامە

لە ماوەی ساڵانی ١٩٨٤- ١٩٨٨ ئوسامە بن لادن و عەبدوڵڵا عەزام زۆر لێك نزیکدەبنەوە، بەیەکەوە کاری جیهادی گەشە پێ دەدەن. بەیەکگەیشتنی بیروڕای هەردوو کەسایەتی، وایکرد (بیرۆکەی جیهادی جیهانی) دابڕێژن[1]

ئەم دووانە لە چوارچێوەی جیهادی جیهانی، دابەش بوون بۆ دوو شێوەکاری جیهادی. عەزام لایەنی هاندان و رێکلامکردن و بڵاوکردنەوەی بیری جیهادی لەئەستۆگرت. بۆ ئەم مەبەستەش عەزام سەری لە وڵاتانی جیهان دەدا، بۆ ئەوەی سەرباز بۆ سەبازگەکان کۆبکاتەوە، لە نێو گروپ و جالیەی ئیسلامی لە وڵاتانی ئەوروپی وتاری پێشکەش دەکرد. عەزام لەم سەردانانەیدا پێشوازی گەرمی لێدەکرا بەهۆی ئەوەی وەك سەرکردەیەکی بەتوانای شەڕی دژ بە سۆڤیەت ناسرابوو. ساڵی ١٩٨٢ لە سەردانێکیدا بۆ ئەمریکا لەلایەن رابیتەی لاوانی مەسوڵمانی ئەمریکی کۆڕێکی بۆ ڕێکخرا. لەوێدا (عصام ریدی) ڕاهێنەری فرۆکەوانی، زۆر پێی سەرسام دەبێت و سەردانی ئەفغانستان دەکات و دەبێتە ئەندامێکی قاعیدە، دواتر ئەم پیاوە ڕۆڵی بەرپرسی کڕینی چەك و فڕۆکەی تایبەتی ئوسامە بن لادن دەگێڕێ[2].

هەرچی ئوسامەش بوو خۆی تەرخان کردبوو، بۆ لایەنی کرداری جیهاد، ئەمەش لەبەرئەوەی کوڕە دەوڵەمەندێکی سعودی بوو، بەئاسانی دەیتوانی پارە بۆ دروستکردنی سەربازگە و دابینکردنی ئامێرە پێویستەکان و کڕینی چەك و جبەخانە و شوێنی حەوانەوەی جەنگاوەران، دەستەبەر بکات.

---

[1] الشرق الاوسط، هەمان سەرچاوە.

[2] القاعدة من الداخل - تاليف: روهان جوناراتانا.

## کوشتنی عەزام

لە ٢٤ نۆڤێمبەری ١٩٨٩ عەزام و دوو کوڕی بە ٢٠کیلۆگرام TNT کە لە ئۆتۆمبێلەکەی چێنرابوو، تیرۆرکران.

سەربارەت بە مەسەلەی تیرۆرکردنی عەزام زۆر بیروڕای جیاواز هەیە، کە جگە لە ئامێری کوشتنەکەی کە ماددەی TNT بووە، سەراپای چیرۆکی تیرۆرکردنەکە لێکجودان.

سەرچاوەکانی دەزگای سیخوڕی ئەمریکی لەو باوەڕەدان کە جیاوازی بیروڕای نێوان[1] عەزام و ئوسامە، وای لە ئوسامە کردووە کە پیلانی تیرۆرکردنەکە بگێڕێ. لەگەڵ کۆتایی هاتنی شەڕی سۆڤیەت، جیاوازی نێوان ئەم دووانە ڕووی لە زیادی کرد. لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٨ و سەرەتای ساڵی ١٩٨٩دا کێشەگەلێك ئەم دووانەی خستە بەرانبەر یەك. سەربازگەی (المساعدة) یەکێ لەو خاڵانە بوو کێشەی جیاوازی نێوان ئەم دوانەی دروستکرد، ئوسامە دەیوست سەربازگەی (المساعدة) ببێتە پاشکۆی ڕێکخراوی قاعیدە، هەرچی عەزام بوو ئەو داواکارییەی ئوسامەی ڕەت کردەوە و دەیوست سەربازگەی (المساعدة)ی سەر سنووری پاکستان و ئەفغانستان بنکەیەکی بێلایەن بێ و تەنها لاوانی وڵاتانی جیهادکەر، بۆ شەڕ ئامادە بکات[2].

خاڵێکی دیکەی جیاوازی نێوان ئەم دووانە، لەسەر ئەرکی (نووسینگەی خزمەتگوزاری) بوو. ئوسامە دەیوست جەنگاوەرانی سەربازگەکانی قاعیدە لەسەر شێوەی چالاکی تیرۆرستی پەروەردە بکرێن، بۆ ئەوەی کاتێ دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانیان بەهێزەوە بگەڕێنەوە. ئەو ڕاهێنانە تیرۆرستیەی بینیوویانە یارمەتیان بدات لە وڵاتەکەیان جێ پێی خۆیان بکەنەوە، بەڵام عەزام وای دەبینی کە

---

[1] هەمان سەرچاوە

[2] هەمان سەرچاوە

جەنگاوەران ئەو ڕاهێنان و مەشقانە تەنها لەناو ئەفغانستاندا بەکاربهێنن.
لەبەرئەوەی (عەزام) خۆی لە میسر بوو، چاك لە ڕەوشی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو وڵاتانە گەیشتبوو، مەترسی تیرۆرستی لەو وڵاتانەی دەزانی، عەزام لەمەدا پشتی بەوە بەستبوو کە فتواکانی ئیسلام ڕێگا نادەن پارە و مەشقی سەربازی بۆ تیرۆرکردن بەکاربهێنرێت و ئەمە مەسەلەیەکی موخالیفی شەریعەتی ئیسلامە. هاوکات لەگەڵ هەڵکشان و توندبوونەوەی جیاوازی نێوان ئەم دووانە، ئوسامە خۆی لە عەزام دوورخستەوە و بۆ (خوست) چوو. هەرچی عەزامیشە لە هەرێمی (حەیات ئاباد) لە بیشاوەر خانووی میوانداری نوێ و سەربازگەی مەشقی تازەی دروستکرد، کە ئەمانە تەواو لە (نووسینگەی خزمەتگوزاری) دابڕابوون. دوای کوشتنی (عەزام) یەکەیەکی توندڕەوی (نووسینگەی خزمەتگوزاری) چووە پاڵ ئوسامە. دوای ئەم کەرتبوونەش ئوسامە دەستەواژەی (سوپای ئیسلامی) بۆ وەسفکردنی هێزەکانی سەر بەخۆی بەکارهێنا.

ئەم ململانێیەی نێوان عەزام و ئوسامە، بەگوێرەی زانیارییەکانی دەزگای سیخوڕی ئەمریکی دەبوایە، یەکێکیان لەناو بچێ، ئەوە بوو لە ٢٤ی نۆڤێمبەری ساڵی ١٩٨٩دا عەزام لەگەڵ دوو کوڕەکەی بۆ نوێژی هەینی لە پیشاوەر دەچوون، چالاکییە تیرۆرستییەکەی بەرانبەر ئەنجام درا[1].

حوزەیفەی کوڕی عەزام، بوونی جیاوازی لە نێوان باوکی و ئوسامەی پشتڕاست کردۆتەوە، لەم بارەیەوە دەڵێت: لەگەڵ دەستپێکردنی کشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئەفغانستان، ساڵی ١٩٨٧، بن لادن پێشنیاریکرد کە پارەی نووسینگەی خزمەتگوزاری کە بە ملیۆنەها دۆلار مەزەندە دەکرا، لە بواری سەربازی خەرج بکرێت، کەچی باوکم (عەزام) دژی ئەوە بوو. پێیوابوو کە ئەرکی یارمەتی و ڕاگەیاندن و پزیشکی و فێرکردنی نووسینگە کەمتر نییە لە چالاکی

[1] منتدى شبكة القمر – حوار مفتوح – بن لادن ذهب الى افغانستان مقتفيا خطى مرشده عبدالله عزام.

سەربازی. باوکم لەسەر ئەو پێشنیارەی ئوسامە ڕازی نەبوو. ئەمەش وای لە ئوسامە کرد ساڵی ١٩٨٧ لە (جەلال ئاباد) یەکەم بنکەی سەربەخۆ بۆ (چەکدارە عەرەبەکان) دابمەزرێنیّ، بەڵام ئەم دوورکەوتنەوەی ئوسامە لە عەزام هەرگیز نەبووە هۆی ئەوەی دابڕان لە نێوانیان ڕوویدات، بەردەوام باوکم سەردانی سەربازگەکانی (جەلال ئاباد)ی دەکرد[1].

جێی ئاماژە بۆ کردنە کوڕەکەی عەزام (حوزەیفە) هەرگیز ئاماژەی بەدەست هەبوونی ئوسامە لە کوشتنی باوکیدا، نەداوە. ئەمەش مەسەلەی تیرۆرکردنی عەزام زیاتر لێڵ دەکات.

هەرچی سەرچاوە ئیسلامییەکانن، چیرۆکێکی تەواو پێچەوانەی دەزگا سیخوڕییەکانی ئەمریکا پێشکەش دەکەن. ئەوان کارە جیهادییەکانی عەزام و بەڕێخستنی ڕەوتێکی ئیسلامی جیهانی بۆ دژایەتیکردنی (ئەمریکا و زایۆنیزم) بە فاکتەرێك دەزانن کە وای لە ئەمریکا و دەزگا سیخوڕییەکانی کردبیّ پیلان بۆ کوشتنی عەزام بخەنە گەڕ، لەم کردەوەیەشدا ئەمریکا فشاری خستبێتە سەر پاکستان و پرۆسەی تیرۆرکردنەکەیان دژ بەعەزام ئەنجام دابیّ[2].

سەرجەم چیرۆکەکانی کۆشتنی (عەزام) بەڵگەی بەرجەستە نادەن بەدەستەوە، دکیۆمێنتی ڕوون و ئاشکرا سەبارەت بە ڕووداوەکە لەبەردەستدا نییە، هەردوولا (ئیسلامی - ئەمریکی) بەگوێرەی پێشنیازی مەزەندەکراو نەخشەی کوشتنەکە دەکێشن، ئەمەش مەسەلەی تیرۆرکردنی (عەزام) بۆ ماوەیەکی دیکە وەك (نهێنی) دەهێڵێتەوە.

عەزام هەر لەوکاتەوەی لە ڕێکخستنەکانی (اخوان مسلمین) نزیك دەبێتەوە، زۆر کاریگەر دەبێت بە بیروڕاکانی (حەسەن ئەلبەنناو سەید قوتب و ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیم).

---

[1] سایتی نبض الاسلام.

[2] کتێبی (عەبدوڵڵا عەزام) نووسینی (محمد عبدالله العامر)، ص ٢٣٨.

## بەرهەمە نووسراوەکانی عەزام

عەزام لە ماوەی ئەو (٤٨) ساڵەی تەمەنیدا، ئەزموونێکی زۆری لەبواری کاری ئیسلامی و بیری ئیسلامی پەیدا کردبوو، ئەمەش وایکرد، کولتوورێکی گەورە لە نووسین و وتار و گۆڤار لەدوای خۆی جێ بهێڵێت کە گرنگترینیان:

- العقيدة واثرها فی بناء الجيل.
- الاسلام ومستقبل البشرية.
- السرطان الاحمر.
- آيات الرحمن فی الجهاد في افغانستان.
- المنادة المفقودة.
- دفاع عن اراضی المسلمين اهم فروض الاعيان.
- الحق بالقافلة.
- عبر و بصائر للجهاد فی العصر الحاضر.
- جهاد شعب مسلم.
- بشائر البصر.
- حماس (الجذور التاريخية والميثاق).
- حكمات من خط النار ج ١.
- جريمة قتل النفس المؤمنة.
- فی خضم المعركة (٣ اجزاء).
- هەندێك کتێبی دیکەی چاپ نەکراو.
- ئەمە سەرباری ئەو چاوپێکەوتن و محازەراتانەی لێرە و لەوێ پێشکەشی کردوون.

# ئوسامه بن لادن

ئوسامه بن لادن ساڵی ١٩٥٧ له دایکێکی سوری و باوکێکی سعودی له سعودیه لەدایکبووه. باوکی (محمد عوض بن لادن) ساڵی ١٩٣٠، له (حضر موت)ەوه هاتۆته (جدده)، سەرەتای ژیانی به حەماڵی دەست پێکردووه، به ماوەیەکی کەم بۆته بەڵێندەرێکی گەورەی سعودیه. زۆرێك له پرۆژەکانی حکوومەتی سعودیەی بەجێهێناوه، ئەمەش وایکردووه (محمد عوض) له میرو میرزادەکانی سعودی نزیك بێت لەناویشیاندا (ئەمیر فەیصەڵ)[١]. کاتێ لەسەر دەسەڵات کێشه لەنێوان مەلیك فەیصەڵ و مەلیك سعود پەیدا دەبێت، باوکی ئەسامه یەکێك بووه لەوانەی توانیویه مەلیك سعود رازی بکا بۆ ئەوەی کورسی دەسەڵات بۆ مەلیك فەیصەڵ جێ بهێڵێت[٢].

کاتێك خەزێنەی دەسەڵات له ئەنجامی ئەو کێشەیەی دەسەڵات بەتاڵ دەبێت، باوکی ئوسامه موچەی کارمەندانی دەوڵەت بۆ ماوەی شەشه مانگ زامن دەکات، ئەم کارەی (محمد عوض) وای له مەلیك فەیصەڵ کردووه به مەرسومێکی مەلەکی هەموو تەندەرەکان بۆ بەرژەوەندی (محمد عوض) ئاراسته بکات، ئەمەش له بری ئەو چاکەیەی که باوکی ئوسامه نواندی[٣].

کاتێك (محمد عوض) کۆچی دوایی کرد، ئوسامه تەنها تەمەنی ٩ ساڵ و نیو دەبوو[٤] له تەمەنی ١٧ ساڵیدا یەکەمین ژن دێنێت، که له خاڵوانەکانی خۆی بوو، ئەوان له سوریا دەژیان. ئوسامه که ڕیزبەندی له نێوان کوڕانی (محمد عوض) دا،

---

[1] شبكة فلسطين للحوار – من سيرة اسامة بن لادن.

[2] www.yafea.8m.com

[3] هەمان سەرچاوە.

[4] www.yafea.8m.com

(۲۱)ه مین ، له کۆی (٥۲) منداڵ بووه [1]. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و زانکۆی هەر له (جدده) تەواو کردووه. کۆلێژی بەڕێوەبردن و ئابووری تەواو کردووه. له ماوەی خوێندنی زانکۆدا چەندین کەسایەتیی ئیسلامی بەناوبانگی ناسیووه. له سەردەمی ژیانی زانکۆدا ئوسامه زۆر کاریگەر دەبێت به هەریەکه له (محمد سید قطب) و (الشیخ عبدالله عزام)، که هەردووکیان بابەتی (ڕۆشنبیری ئیسلامی)یان له زانکۆدا دەگوتەوە [2].

جگه له (عەزام) و (سید قوتب) ، دیوەخانی باوکیشی کاریگەری لەسەر ئوسامه هەبووه، که زۆرێك له کەسایەتییه ئیسلامییەکان بەتایبەت لەکاتی (حەج و عەمرە)دا دەهاتن له دیوەخانی (محمد عوض) دا میوانی دەبوون و گفتوگۆیان لەسەر بابەته ئیسلامییەکان دەکرد.

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی هەواڵی داگیرکاری سۆڤیەت بۆ ئەفغانستان، له ساڵی ۱۹۷۹ ئوسامه له ڕێگەی (جەماعەتی ئیسلامیی پاکستان) له ریازەوە بۆ پاکستان دەچێ [3]. لەوێ لەلایەن سەرکردە موجاهیدەکانی ئەفغان: عبد الرب الرسول سیاف [4] و برهان الدین رەبانی [5] ەوە پێشوازیکراوە [6]. کاتێ ئوسامه دەگاته (پیشاوەر) تەنها چەند (ئەفغانێکی عەرەب) لەوێ دەبن [7].

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٦٩١، سنة ٢٠٠٢.

[2] شبكة فلسطين للحوار — من سيرة اسامة بن لادن.

[3] کتێبی (القاعدة من داخل)، تاليف روهان جوناراتا.

[4] سیاف: به مەلا ناسرابوو، سەرکردەی (حزب التحرير الاسلامی) بوو.

[5] برهان الدين رباني: توێژەرەوەی زانسته ئایینییەکان و سەرکردەی کۆمەڵی ئیسلامی بوو.

[6] شبكة فلسطين للحوار، من سيرة اسامة بن لادن، هەروەها سەیری (القاعدة من الداخل) بکه.

[7] القاعدة من الداخل، هەمان سەرچاوە.

ئوسامه مەبەستی لەم سەردانەی بۆ (پیشاوەر) ئەوە بوو، لە نزیکەوە ئاگاداری ڕەوشی خەباتی ڕووبەڕووبوونەوەی هێزەکانی ڕووس بێ و ئامادەکاری بۆ سەردانی داهاتوو ڕێکبخات. دواتر دەگەڕێتەوە بۆ سعودیە و لەگەڵ برا و خزم و کەسەکانیدا باسی مەسەلەی یارمەتیدانی ئەو (جیهادە ئەفغانییە)ی کرد، ئەنجامی ئەو هەولانەی ئوسامە ئەوە بوو، چەندین پەیوەندی گرێدا بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی دارایی بۆ (موجاهیدانی ئەفغان)ی[1]. ئوسامە ئەو یارمەتییە داراییانە و کۆمەڵێ پاکستانی و ئەفغانی ئەوانەی لە (دامەزراوەی بن لادن) کاریان دەکرد لەگەڵ خۆی بۆ پاکستانی بردنەوە. ئەم جارەش ماوەی مانگێك لەوێ مایەوە. ئوسامە ئەم هاتووچوونەی لە نێوان سعودیە و پاکستان چەند جارێك دووبارە کردۆتەوە، هەر جارەی کۆمەڵێ کۆمەك و کەسانی لە هەمە جۆر ڕەگەزی لەگەڵ خۆیدا بردووە.

ئوسامە لە هیچ یەکێك لەم سەردانانەی نەچۆتە ناو ئەفغانستان، تاکو ساڵی ١٩٨٢ ئوسامە بڕیار دەدات سنووری ئەفغانستان ببڕێت و ڕاستەوخۆ بەشداری لە جیهاد بکات[2].

ئوسامە کە چووە ناو ئەفغانستان سروشتی چیای ئەوێی بینی و بڕیاریدا سوود ەکەلوپەلی کۆمپانیاکەی خۆی وەربگرێت، بۆیە ژمارەیەکی زۆری شۆفڵ و تراکتۆر و حەفارەی لەگەڵ خۆیدا برد، بۆ ئەوەی یارمەتی (موجاهیدان) بدات و ڕێگاکان خۆش بکات و سەربازگەی پێ دروست بکات[3] ئەم سەردانانەی ئوسامە ە شێوەیەکی پچڕ پچڕ تاکو ساڵی ١٩٨٤ بەردەوام بوون.

---

[1] شبكة فلسطين للحوار، هەمان سەرچاوە.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] www.yafea.8m.com

ساڵی ١٩٨٤ یەکەم نموونەی کاری دامەزراوەی جیهادی عەرەب لە ئەفغانستان لە چوارچێوەی (بیت الانصار) لە پیشاوەر، دەرکەوت[1].

ئەو (بیت الانصار)ە وەك وێستگەیەك بۆ پێشوازی ئەوانەی لە وڵاتانی عەرەبییەوە بۆ جیهاد لە ئەفغانستان دەهاتن، دروستکرا. هەتا ئەو کاتەش ئوسامە هیچ ڕێکخراوێکی تایبەت بەخۆی نەبووە، ئەو لاوە عەرەبانەی دەشهاتن دوای ئامادەکردنیان تەسلیم بە حزبەکەی حیکمتیار، یان سەیاف، یان ڕەبانی دەکران.

لەوکاتەی کە ئوسامە (بیت الانصار)ی دروستکرد، عەزام (نووسینگەی خزمەتگوزاری) لە پیشاوەر دروستکردبوو. ئەم دوو دامەزراوە لەلایەن ئەم دووانە تەواوکاری کاری جیهادی ئەفغانی بوون.

ساڵی ١٩٨٦ ئوسامە بڕیاریدا سەربازگەی تایبەت بەخۆی هەبێت، بۆیە لە ماوەیەکی کورتدا توانی (٦) سەربازگە لە ئەفغانستان دروست بکات[2].

ئەم سەربازگانەش بەگوێرەی ڕەوشی شەڕەکان جێگۆڕیان پێ دەکرا، بەمەش لەمەودوا ئیتر ئوسامە خۆی لاوە عەرەبەکانی بەسەرباز دەکرد و ڕەوانەی بەرەکانی شەڕی دەکردن. دوای ئەوەی خواستی چوونە شەڕی سۆڤیەت لە وڵاتانی کەنداو ڕووی لە زیادی کرد.

ساڵی ١٩٨٨ ئوسامە تۆماری بنچینەیی (سجل القاعدة) بۆ ناونووسکردنی چەکدارە عەرەبەکان دەدانێت، بیرۆکەی (سجل القاعدة)ش، دوای ئەوە هات کە زۆر لەو خانەوادانەی ڕۆڵەکانیان بەهۆی ئوسامەوە بۆ شەڕی ئەفغان وڵاتیان جێ هێشت، دوای کوژرانیان، هیچ زانیارییەکیان، لەدوا بە جێ نەدەما، ئەمەش ئوسامەی شەرمەزار کردبوو، کە نەیدەزانی چ وەڵامی ئەو خانەوادانە بداتەوە، بۆیە بڕیاریدا تۆمارێك بۆ هەموو ئەوانە بکاتەوە کە بەمەبەستی (جیهاد) ڕوویان

---

[1] شبكة فلسطين للحوار.

[2] لە باسی (سەربازگەکانی ئەفغانە عەرەبەکان) بەدرێژی باسیان دەکەین.

له سەربازگەکانی ئەفغانستان دەکرد، ئەو تۆمارە: ناو، ناوونیشان، تەمەن، شوێنی مانەوە و سەربازگەکانی تێدا دەنووسرا[1].

ساڵی ١٩٨٩ لەبەرەبەری کۆتایی شەڕی ئەفغان، ئوسامە بۆ سعودیە دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەو جارەیان جیا لە جارانی پێشوو، دەسەڵاتدارانی سعودی هاتووچۆی سنووردار دەکەن، هەر هەمان ساڵ (عەزام) تیرۆر دەکرێت، لەکاتێکدا ئوسامە لە سعودیە دەبێت. هەر لەو ساڵەوە ئوسامە کەوتە نێو لاپەڕەکانی ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەکان. ئوسامە دوای ئەوەی بینی مانەوەی لە سعودیە مەترسیدارە، ئەگەری دەست بەسەرکردنی نزیك بۆتەوە، دوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراق، ڕێگەی دەرچوون دەدۆزێتەوە، سەرەتا بۆ پاکستان دواتر بۆ ئەفغانستان دەگەڕێتەوە.

دوایکوژرانی عەزام و کۆتایی هاتنی شەڕ دژ بە سۆڤیت و سەرکەوتنی ئەفغانەکان لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٩ و سەرەتای ساڵی ١٩٩٠، ئوسامە بینی ئەفغانییەکان توشی (فیتنە) هاتوون، دۆستی دوێنێ بووەتە دوژمنی ئەمڕۆ. یەکەم بڕیاری ئوسامە دوای گەڕانەوە بۆ لای چەکدارە عەرەبەکان، ئەوەبوو کە خۆیان لە شەڕی نێوخۆیی لایەنە سیاسییەکانی ئەفغان نەگلێنن. زۆر هەوڵی دا لایەنە پێکناکۆکەکانی ئەفغان ئاشت بکاتەوە، بەڵام بێ سوود بوو. دوای ئەوەی بینی مانەوەی لە ئەفغانستان بێ سوودە، لەکاتێکدا دەزگا سیخوڕییەکانی ئەمریکا چەند جارێك هەوڵی تیرۆرکردنیان دا، بڕیاریدا ژینگەیەکی دیکە، بۆ درێژەدان بەجیهاد پەیدا بکات. باشترین ژینگەش بۆ ئەو سەردەم لای ئوسامە (سودان) بوو.

ساڵی ١٩٩٠ بارەگای قاعیدەی بۆ سودان گواستەوە، ساڵی ١٩٩١ بە فڕۆکەیەکی تایبەت و بەنهێنی ئەفغانستانی بەرەو سودان بەجێ هێشت،

---

[1] هەمان سەرچاوە

حکوومەتی سودان پێشوازی لێکرد و شوێن و حەوانەوەی بۆ خۆی و دارودەستەکەی دابینکرد[1].

لە سودان، سەرەتا ئوسامە هیچ کردەوەیەکی سەربازی نەنواند. بەچەند پرۆژەیەکی بیناسازی و ڕێگاوبان و کشتوکاڵی خەریکبوو، پەیوەندیشی لەگەڵ سعودیە تا دەهات خراپ دەبوو، بەڵام نەگەیشتبووە خاڵی دابڕان، بەڵام بەهۆی فشاری زۆری شانشینی سعودی و دەزگا سیخوڕییەکانی ئەمریکا بۆ سەر حکوومەتی سودان، بەڕاددەیەك لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٣ و سەرەتای ساڵی ١٩٩٤ سێ کەس کە یەکێکیان لیبی بوو، هەوڵی کوشتنی ئوسامەیان دا. جارێك لەکاتی نوێژکردنیدا لە مزگەوت، (٦) کەس، نوێژکەران دەدەنە بەر گوللە و (٦١) نوێژکەر دەکوژن، جارێکی دیکەش لە بارەگای شەریکەکەی هێرش دەکەنە سەر ئوسامە و دواتر لەماڵەکەشیدا، ئەم فشارانە وایان لە ئوسامە کرد، بیر لە بەجێهێشتنی سودان بکاتەوە و دووبارە ڕوو لە ئەفغانستان بکاتەوە.

لە ئایاری ١٩٩٦دا هاوەڵە ئەفغانییەکانی ئوسامە، دوای ئەوەی بینیان ئوسامە لەژێر فشار دایە، داوایان لێکرد، بێتەوە ئەفغانستان. ئەوەبوو فرۆکەیەکی تایبەت، ئوسامە و سێ ژنەکەی و ١٣ منداڵ و کۆمەڵێ دۆستی ئەفغانی عەرەبی بۆ فرۆکەخانەی جەلال ئاباد لە ڕۆژهەڵاتی ئەفغانستان گواستەوە[2].

ئەو ساڵەی کە ئوسامە گەڕایەوە ئەفغانستان، بزووتنەوەی تالیبان دەسەڵاتی ئەفغانستانی بەدەستەوە گرتبوو، لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٧ و سەرەتای ١٩٩٨ دا ئوسامە بڕیاریدا دووبارە لەگەڵ زاناکانی تالیبان و پاکستاندا دەست بە چالاکی

---

[1] هەمان سەرچاوە

[2] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٤٢٧، سنة ٢٠٠١.

نواندن بکاتەوە، بەمەش توانی ئیسلامییەکانی هەردوولا ڕازی بکات لەمەڕ بەیاننامەی دەرکردنی (کافران) لە دوورگەی عەرەبی[1].

هەر لە ساڵی ١٩٩٨ دا ئوسامە و ئەیمەن زەواهیری بەیەکەوە بەرەیەکی تازەیان دژ بە ئەمریکا و سەهیۆنییەکان کردەوە و لە بەیانێکدا هەردوولا یەکگرتنی خۆیان ڕاگەیاند و (بەرەی ئیسلامی جیهانی بۆ دژایەتیکردنی یەهود و کوفر)یان جاڕدا[2].

---

[1] شبكة فلسطين للحوار.

[2] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٧٨٢، سنة ٢٠٠٢.

## ئەیمەن زەواهیری

هەروەك ئیسلامییەکان دەڵێن، زەواهیری ناوی پێشەوا عبدالرحمن ئەیمەن محمد زەواهیرییە، لە ١٥ی ڕەمەزانی ساڵی ١٩٥١ لە گەڕەکی (المعادی) شاری قاهیرەی میسری لەدایکبووە[1].

باوکی زەواهیری (دکتۆر محمد ڕەبیع زەواهیری) مامۆستای کۆلێژی پزیشکی زانکۆی (عین الشمس) بووە و لە ناودارترین دکتۆرەکانی میسر بووە[2].

باپیری (ڕەبیع زەواهیری) پێشەوایەکی گەورە و شێخی ئەزهەر بووە[3]. خاڵەکانیشی بەرپرسیارێتی گەورەیان لە میسردا بینیوە، (سالم عەزام) ئەمینداری ئەنجوومەنی ئیسلامی ئەورووپی بوو (محفوظ عزام)یش جێگری سەرۆکی پارتی کاری میسری بووە[4]. کەواتە زەواهیری لە خانەوادەیەکی ڕۆشنبیر و نزیك دەسەڵات ژیاوە، بۆیە سەیر نییە کاتێك لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا، بە تاوانی پەیوەندی هەبوونی بە کۆمەڵی (اخوان مسلمین)ەوە دەستگیر دەکرێت، کە ئەو کات پارتێکی یاساغ بووە[5]. خوێندنی سەرتایی و ناوەندی لە قوتابخانەی (میسر نوێ) و (المعادی) تەواو کردووە، خوێندنی زانکۆی لەکۆلێژی پزیشکی (قصر العین) لە زانکۆی میسر ساڵی ١٩٧٤ تەواوکردووە[6]. دوای چوار ساڵ ١٩٧٨ بڕوانامەی ماستەر بە پلەی زۆرباشە لە هەمان زانکۆ وەردەگرێت. لە زانکۆی

---

[1] منبر التوحید والجهاد – الملف الخاص بایمن الظواهیری.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] سایتی CNN

[4] منبر التوحید والجهاد.

[5] سایتی CNN

[6] منبر التوحید والجهاد

(پاکستان)یش دکتۆراکەی تەواو کرد[١]. ساڵی ١٩٧٩ لە هۆتێلی (کۆنتنتاڵ) ئاهەنگی ژن هێنانەکەی بەڕێوڕەسمی ئیسلامی سازدەکات[٢].

ساڵی ١٩٨١ تاکو ١٩٨٥ بەشداری لە دامەزراندنی (جماعة الجهاد)ی میسر کردووە[٣].

ساڵی ١٩٨١ بەتۆمەتی بەشداریکردنی لە هەوڵی تیرۆرکردنی سەرۆکی پێشووی میسر (ئەنوەر سادات)، تاوانبار دەکرێت[٤]. زەواهیری کاتێك دەستگیر دەکرێت، بۆ دەسەڵاتدارانی میسری دەردەکەوێت کە ئەندامی شانەیەکی نهێنییە، کە لە ساڵی ١٩٦٨ دامەزراوەو زەواهیریش (ئەمیر)ی ئەو شانەیەیە[٥]. دادگای میسری بە سێ ساڵ بەندیی فرمانی بۆ دەردەکات[٦].

ئەیمەن زەواهیری دوای ئازادکردنی لە بەندیخانە ساڵی ١٩٨٥ بەرەو سعودیە دەچێت، وەك پزیشکێك لە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی سعودیە کاردەکات، بەڵام زۆر لەم کارە نامێنێتەوە، بۆ پاکستان دەچێت، دواتر بۆ ئەفغانستان[٧].

مونتەسر زەیات، پارێزەری ئیسلامییەکانی میسر لە کتێبی (ڕێگا بۆ ناو قاعیدە)دا دەڵێت: یەکەم هەنگاو بۆ ناو قاعیدە دەستی پێکرد، سەرەتا بۆ ساڵی ١٩٨٠ دەگەڕێتەوە کە بۆ یەکەمجار زەواهیری پێی نایە ناو خاکی ئەفغانستان و بینی ئامێزێکی گونجاوە بۆ کاری جیهادی، لە ماوەی ساڵانی ١٩٨٠-١٩٨١دا زەواهیری دووجار بەئەرکی بەهاناهاتنی خەڵکی لێقەوماو چۆتە ئەفغانستان و

---

[1] سایتی الجزیرة نت، ٣/١٠/٢٠٠٤.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] هەمان سەرچاوە.

[4] سایتی CNN

[5] سایتی الجزیرة نت، ٣/١٠/٢٠٠٤.

[6] سایتی CNN

[7] سایتی الجزیرة نت،٣/١٠/٢٠٠٤

ماوەی (٧) مانگ ماوەتەوە، لەم ماوەیەدا هەروەك لە كتێبی (سوارچاكانی ژێر ئالآی پێغەمبەر – فرسان تحت راية النبي) دا دەڵێت: (هەر لەساڵی ١٩٨٠ ەوە، بۆم دەركەوتووە كە ئەم خاكە چەندە دەوڵەمەند و بەپیتە بۆ ئومەتی ئیسلامی و بەتایبەت بۆ بزاوتی جیهادی)[1].

هەروەها زەیات دەڵێ: زەواهیری توانی ئاڵوگۆڕێكی ریشەیی بەسەر بیری ئوسامە بن لادن دا بێنێ، دوای ئەوەی ساڵی ١٩٨٦ لە ئەفغانستان یەكتریان بینی، زەواهیری توانی سوود لەو دۆستایەتی و برادەریەتیەی خۆی لەگەڵ ئوسامە وەربگرێت و ئوسامە لە كەسێكی كاریگەر بەبیری (ئیسلامیی سەلەفی) بۆ كەسێكی (ئیسلامیی جیهادیی شۆڕشگێڕ) بگۆڕێت[2].

زەواهیری لەمیانەی تێڕامان لە ڕەوشی ئەفغانستان هەر لە ساڵی ١٩٨١ تاكو ساڵی ١٩٨٦ ئەم تێبینیانە تۆمار دەكات[3]:

١- بزووتنەوەی جیهادی ئیسلامی پێویستی بە گۆڕەپانی ڕاهێنان و كوشتارگە و مەودای سیاسی و ڕێكخستن هەیە.

٢- لەو خەباتەی لاوانی موسوڵمان لە گۆڕەپانی شەڕ نواندیان، ئەوەیان سەلماندووە، كە دەتوانن لەژێر دروشمێكی ئیسلامیی پاك و بێگەرددا خاكی موسوڵمانان ڕزگاربكەن.

٣- گۆڕەپانی ئەفغانستان بووە نموونەی شەڕێكی مەزن بۆ لاوانی موسوڵمان.

٤- گرنگی شەڕی جیهاد لە ئەفغانستان وەهمی بالآدەستیی پاكستان، توركیا و وڵاتانی ناوەڕاستی ئاسیا بەرۆژهەڵات و ڕۆژئاوایەوە تێكشكاند، دەرگای لەبەردەم لاوانی موسوڵمان والآكرد كە بەرەو جیهادی ئەفغانی بێن، بەمەش

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٩٢٠٣، سنة ٢٠٠٤.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] موقع الاحداث المغربية، السبت ٢٧ اوغست ٢٠٠٥.

لاوانی عەرەبی موسوڵمان لە گۆڕەپانی جیهادی ئەفغانی یەکتریان ناسی و زیاتر کارابوون. لە گۆڕەپانی خەبات ئامادەبوون و لە گیروگرفتەکانی یەکتر گەیشتن.

٥-ڕاهاتن لەسەر (جیهادی حوکام)[1].

هەرچەند زەواهیری لە سەرەتاکانی دروستبوونی (قاعیدە)دا هیچ پایەیەکی ئیداری یان سەربازی نەبوو، بەڵام لە دوای ساڵی ١٩٨٩ ەوە ئامادەبوونی لە کۆبوونەوە گرنگەکانی قاعیدە ئامادەبوونێکی بەردەوام بوو، ئیتر پلەوپایەی گرنگی لەناو قاعیدە وەرگرت، سەرۆکی لیژنەی ئایینی بوو کە یەکێ بوو لە دامەزراوە گرنگەکانی قاعیدە کە (فەتوا) و (ئەحکامی) یاسایی دەردەکرد، هەروەها ئەندامی ئەنجوومەنی شورای قاعیدەش بوو. ئوسامە، زەواهیری کردە سەرکردەی باڵی سەربازیی قاعیدە و نازناوی (ئەمیر)ی پێ بەخشی[2].

دوای کۆتایی هاتنی شەڕی ئەفغان دژ بە سۆڤیەت و بەرپابوونی شەڕی نێوان لایەنە ئەفغانییەکان لەسەر دەسەڵات، هەریەکە لە زەواهیری و بن لادن مانەوەیان لە ئەفغانستان بێ بەها دەزانی. بۆیە ساڵی ١٩٩٣ زەواهیری و بن لادن هاوڕێ لەگەڵ سەدان لاوی عەرەب بەرەو سودان دەچن[3].

لە ساڵی ١٩٩٥ لە گۆڤاری (المجاهدون)، کە لە نیسانی ١٩٩٥ دەرچوو، سەبارەت بە کێشەی فەلەستین و رزگارکردنی قودس دەڵێ: قودس ڕزگار ناکەین تاکو شەڕ لە میسر و جەزائیر یەکلا نەبێتەوە و قاهیرە ڕزگار نەکەین[4]. ساڵی ١٩٩٦ دوای ئەوەی (بزووتنەوەی تالیبان) دەسەڵات لە ئەفغانستان وەردەگرێت

---

[1] جیهادی حوکام (جهاد الحكام): ئەو خەباتەیە کە لاوانی عەرەبی راهێنراو لە سەربازگەکانی ئەفغانستان دوای گەڕانەوەیان بۆ وڵاتانی خۆیان دژ بە دەسەڵادارانی وڵاتی خۆیان ئەنجامی دەدەن.

[2] القاعدة من الاخل – تاليف: روهان جوناراتانا

[3] سایتی الجزيرة نت، ٢٠٠٤/١٠/٣.

[4] هەمان سەرچاوە.

بۆ ئەفغانستان دەگەڕێتەوە[1]. بەڵام لەبەرئەوەی باری دارایی ڕێکخراوەکەی (تنظیم الجهاد) خراپ دەبێت، ئوسامە بن لادن بەڵێنی ئەوەی دەداتێ، لەژێر ئاڵای تالیبان پارێزگاری خۆی و ڕێکخستنەکەی بکات.

منتصر الزيات لە باسی ئەو پەشێوییە ئیداری و داراییەی کە (تنظیم الجهاد) پیادا ڕۆیشت دەنووسێ: ئەو بارە نالەبارەی ڕێکخراوەکەی زەواهیری، وای لە زەواهیری کرد بە پێشنیارەکەی بن لادن ڕازی بێ و ساڵی ١٩٩٨ (بەرەی ئیسلامیی جیهانی بۆ دژایەتی ئەمریکا و سەهیۆنییەت) پێکبهێنن. ئەگەر بن لادن سەرۆکی ئەو بەرەیە بووبێ، ئەوا زەواهیری یەکەم داینەمۆ و نەخشەسازی بووە، بە هاوکاری جیهادکەرانی میسری وەك ابو حفص میسری و سیف العدل و نصر فهمي (ناسراو بە محمد صلاح) و طارق انور سيد احمد[2].

مۆرکردنی زەواهیری لەسەر ئەو بەرەیە بەهەڵگەڕانەوە لەو بانگەشانەی پێشووی دەژمێردرێت، چونکە هەروەك باسمان کرد، زەواهیری ڕای وابوو کە پێویستە جیهاد دژ بە دوژمنی نزیك، پێش دوژمنی دوور بکرێت، بۆیە گوتی: قودس ڕزگار ناکەین تاکو میسر ڕزگار نەکەین، بەڵام چونە پاڵ (بەرەی ئیسلامی جیهانی) ڕێك پێچەوانەی ئەو بانگەشانە هاتەوە، ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەهات زەواهیری لە دژایەتی کردنی دوژمنی نزیك (دەسەڵاتدارانی میسر) سەرکەوتوو نەبوو، زۆرێك لە کردە تیرۆرستیەکانی (تنظیم الجهاد) لە میسر بێ ئاکام بوون.

لە بەشەکانی دیکەی ئەم نووسینەدا، زیاتر شارەزای کارو کردەوەکانی زەواهیری دەبین و چۆنیەتی کارکردنی لەناو ئەفغانستان و سەردەمی شەڕی ئەمریکا بۆ سەر ئەفغانستان و هاندانی (عەرەبە ئەفغانەکان) بۆ شەڕ، هەروەها بڵاوبوونەوەی شانە نهێنییەکانی بەسەرجەم وڵاتانی دونیادا.

---

[1] منبر التوحيد والجهاد، الملف الخاص بايمن الظواهري

[2] جريدة الشرق الاوسط، العدد٩٢٠٣، سنة ٢٠٠٤.

## نووسینەکانی زەواهیری[1]

أ- کتێب و توێژینەوەکانی

- الولاء والبراء: عقيدة منقولة و واقع مفقود
- الكتاب الاسود
- المصر المسلمة بين سياط الجلادين وعمالة الخائنين
- الحصاد المر... الاخوان المسلمين في ٦٠عاما
- شفاء صدور المؤمنين

ب-گفتوگۆکانی

- الكلمة الممنوعة

ج- بابەت و نامەکانی

- شربات وسكر
- فلن ينفعكم الفرار
- الطريق الى القدس يمر عبر القاهرة
- ايها الاخوان تعالوا الى حكمة سواد
- السقوط
- ابن باز... بين الحقيقة والوهم

د- فتواکانی

- موقفنا من ايران.

---

[1] منبر التوحيد والجهاد، الملف الخاص بايمن الظواهری

# بەشی دووەم

## لە کۆماری ئەفغانستانی کۆمۆنیستییەوە

## بۆ ئیمارەتی ئیسلامی لە ئەفغانستان

لەوانەیە ئەمە بۆ خوێنەری ئەم توێژینەوەیە جێی پرسیار بێت، بۆچی باس لە ئەفغانستان بکەین پێش ئەوەی باسی دیاردەی (ئەفغانە عەرەبەکان) بکەین ؟ باسکردنی ئەو مێژووە، گرنگییەکەی لەوەدایە، ئەو دیاردەی ئێمە لێی دەکۆڵینەوە لەسەر زەمینەیەك گەشەی کردووە و دارێژراوە و پەلوپۆی بەدونیادا بڵاوکردۆتەوە، پێی دەگوترێت ئەفغانستان.

گرنگە خوێنەر بزانێ ئەو زەمینەی کە هەریەکە لە (عەزام و ئوسامە و زەواهیری) بە زەمینەیەکی لەباری گەشەسەندنی بزاوتەکە ناویان هێناوە، چ زەمینەیەك بووە، بۆچی ئەو گرنگییەی لای ئەوان پەیداکردووە. بۆچی ئەفغانستانیان هەڵبژاردووە بۆ گەشەپێدانی کردەوەکانیان، بۆچی شوێنێکی دیکە ئەو گرنگییەی نەبووە.

لە مانگی ١١ی ساڵی ١٩٧٩ هێزەکانی سۆڤیەت ئەفغانستانیان داگیر کرد[1]، پشتیوانی دامەزراندنی حکوومەتێکی کۆمۆنسیتیان بەسەرۆکایەتی (نجیب الله)کرد

، ئەم داگیرکارییە دەنگدانەوەیەکی فراوانی لەنێو وڵاتانی ئیسلامی بەگشتی و دەوڵەتانی کەنداوی عەرەبی و میسر بەتایبەتی هەبوو.

لە بەرانبەر ئەم داگیرکارییەی هێزەکانی سوپای سووری سۆڤیەت بۆ ئەفغانستان، گەلانی ئەفغانی دەستەوستان نەمان، خەباتی چەکدارییان دەست

---

[1] القاعدة من الداخل:- تاليف روهان جوناراتانا.

پێکرد. لەبەرئەوەی دەوڵەتی داگیرکەر هێزێکی کۆمۆنیستی و بە قەولی ئیسلامییەکان لادین بوو، بۆیە سەیر نییە وەك پەرچەکردارێك ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامی لە خۆی کۆیکاتەوە. لە گۆڕەپانی خەباتی ئیسلامی چەندین حزب و گرووپی ئیسلامی — نائیسلامی هاتنە مەیدانەکە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- ژەنەراڵ عبدالرشید دۆستەم: لایەنگری ڕژێمی کۆمۆنیستی بوو، سەرۆکی میلیشیای شیوعیی ئۆزبەکی بوو. سەرباری پارێزگارییکردن لە حکوومەت، سەرپەرشتی هێزەکانی (نجیب الله)شی دەکرد. چەکدارەکانی دۆستەم خۆیان لە (٤٠) هەزار کەس دەدا، بە باشترین چەك و مەشقی سەربازی پەرداغ کرابوون. سیاسییەکی لێهاتوو و زانا. کاتێ زانی ڕژێمی کۆمۆنیستی دەڕووخێ، شارەکانی باشووری بێ شەڕ تەسلیم بە (ئەحمەد شاە مەسعود) دژ بە دوژمنەکەی (قەلبەددین حکمەتیار) کرد. شەڕی نێوخۆی ئەفغانستانیش وەك ئیسلامییەکان دەڵێن لە سەردەستی ئەم پیاوە دەستی پێکردووە.

دوای باڵادەستبوونی تالیبان هێزەکانی بۆ (٣٠) هەزار کەم بۆتەوە، لە ساڵی ١٩٩٦ ویستی کابوڵ لە دەستی تالیبان دەربهێنێ، بەڵام هێزەکانی (جەلالەددین حەقانی) سەرکردەی هێزەکانی تالیبان، هێرشەکەی تێکدەشکێنێ.

٢-احمد شاە مەسعود: یەکێك بوو لە سەرکردەکانی (حزب الجمعیة الاسلامیة) بەسەرکردایەتی (بورهانەددین رەبانی)، میدیاکان بە پاڵەوانی شەڕی دژی سۆڤیەت ناساندیان، بەتایبەت لە دۆڵی (بەنگ شێر) بەرخودانێکی بێ وێنەی نواند. مەسعود بە دوژمنی سەرسەختی (حکمەتیار) ناسراوە. بۆ ماوەی چەندین ساڵ شەڕی لەگەڵ هێزەکانی حکمەتیاردا کردووە، ڕۆڵێکی بەرچاوی لە لەناوبردنی نەیارانی لە موجاهیدانی باکوور هەبووە. لایەنگیرییەکی زۆری (عەرەبە ئەفغانەکان و عەبدوڵلا عەزام)ی بەدەست هێناوە بەتایبەتی لە سەردەمی جیهادی ئەفغانی بەشێری (بەنگ شێر) ناویان هێناوە، چەکدارێکی زۆری (حکمەتیار)ی بە بەرچاوی ڕۆژنامەنووسانەوە لە سێدارە داوە. کاتێ تالیبان

دەسەڵات بەدەست دەگرێ، شاه مەسعود خۆی لە باگرام قایم دەکات، هەرچەندە هێزەکانی لە هێزەکانی دۆستەم کەمتر بوون، بەڵام بە دوژمنی ترسناکی تالیبان دادەنرا، ئەمەش لە بەر ڕابردووە پڕ خەباتەکەی.

٣- پارتی یەکێتیی شیعە و شیعەکانی ئەفغانستان لە بامیان و مەزار شەریف: شیعەکانی ئەفغان لە ٥ تا ٧٪ ی دانیشتووانی پێکدێنن و زۆربەیان لە هەرێمی بامیان لە باکووری ڕۆژئاوای ویلایەتی کابوڵ نیشتەجێن. هەندێکی دیکەشیان لە هەرێمی مەزار شەریف لە ویلایەتی (بەلخ) نیشتەجێن. پارتی (وەحدەی شیعی) یەکێکە لە (٥) حزبە شیعییەکەی کە ئێران دوای داگیرکاری سۆڤیەت لە ئەفغانستان دروستی کردوون، ئەم پارتە بە نۆرە هاوپەیمانێتیان لەگەڵ (ڕەبانی — حکمەتیار- سەیاف)دا بەستووە، ئەمانە سوودێکی زۆریان لەو هاوپەیمانێتیە بینیوە، بە تایبەت لە سەردەمی شەڕی ناوخۆدا. هەندێ لە شیعەکان خەباتیان دژی سۆڤیەت کردووە، بەڵام زۆربەیان هاوپەیمانی حکوومەتی شیوعی بوون. بزووتنەوەی تالیبان بە چاوێکی سووك سەیری کردوون و بە ڕێگر و دز ناساندونی. دوای کۆتایی هاتنی شەڕی رووس و دامەزراندنی حکوومەتی (ڕەبانی) داوای ٢٥٪ ی وەزارەتەکانیان دەکرد. کاتێ تالیبان دەسەڵاتی وەرگرت زۆربەی سەرکردەکانی بۆ مەزار شەریف و دەرەوەی وڵات هەڵاتن.

٤- عەبد ڕەب ڕەسوڵ سەیاف: کەسێکی ناوداری ئەفغانی بوو، چونکە یەکەم کەس بوو سەکردایەتیی هاوپەیمانی پارتە موجاهیدەکانی کرد. خاوەن حزب نەبوو، لایەنگیریشی نەبوو، یارمەتیەکانی (دارایی) عەرەب بەتایبەتی سعودیە و ڕێکلامەکانی (عەبدوڵا عەزام) و پاڵپشتیکردنی، وایکرد پارتێك دابمەزرێنێ و دەست بەسەر پارە و پولی کۆمەڵە پارتە هاوپەیمانەکاندا بگرێ، سەرباری ئەمانەش ژمارەی چەکدارانی نەگەیشتە (٣) هەزار کەس. سەیاف پشتی بە موناوەرە و فێڵ لە نێوان پارتەکان بەستبوو. سەرسەختانە شەڕی لە دژی

شیعەکان کردووە و بەیەکجاری چووە پاڵ (ڕەبانی) و حکوومەتەکەی و دژی (حکمەتیار) وەستا و هاوپەیمانی لەگەڵ دۆستەم بەست. زۆربەی ئەفغانەکان لەو باوەڕەدان (سەیاف) نێوانی (حیکمەتیار و مەسعود)ی تێکداوە. دوای هاتنی تالیبان بۆ دەسەڵات (سەیاف) رادەکات و سەرکردەی هێزەکانی بە (تاج موحەمەد) دەدات و ئەویش لە بەرانبەر هێزەکانی تالیبان دەشکێ. دوای ئەو تێکشکانە پارتەکەی سەیاف هەڵدەوەشێتەوە و بەشێك لە چەکدارەکانی دەدەنە پاڵ تالیبان.

٥ - بورهانەددین رەبانی (سەرۆکی ئەفغان)

بورهانەددین رەبانی سەرۆکی یەکێك لەو دوو حزبە گەورەیەی ئەفغان: (الجمعیة الاسلامیة) بوو، کە خەباتی دژی سۆڤیەت جاڕدابوو. سەر بە ڕەگەزی فرسوانی دووەم گەوەرەترین پێکهاتەی ئێتنی بوو لە ئەفغانستان، کە ٢٠٪ دانیشتوانی پێکدەهێنا. هەریەکە لە (دۆستەم) و (مەسعود) پاڵپشتیان کرد و، بوو بە سەرۆکی کۆماری ئیسلامی دوای ڕووخانی ڕژێمی پێشوو. تالیبان حوکمڕانی (ڕەبانی) بە فەساد دەزانن، چونکە خۆی لە شیوعییەکان نزیك کردەوە و ژنانی لە دامو دەزگاکانی دەوڵەت دەرنەکرد. دوای هاتنی تالیبان بۆ دەسەڵات پارتەکەی لەناو چوو، هەندێ لە لایەنگرانی چوونە ناو تالیبان و ئەوانی دیکە پەرتەیان لێکرد.

٦- قەلبەددین حکمەتیار:

لەو کەسانە بوو، بۆ یەکەم جار بیرۆکەی هەڵگرتنی چەکی بەڕووی هێزەکانی ڕووس وروژاند، لە سەردەمی دەسەڵاتی سەرۆکی پاکستان (عەلی بۆتۆ) (زیا ئەلحەق) و کچی بۆتۆ (بەنازیر بۆتۆ) بە بەردەوامی یارمەتیان داوە، تادەگاتە (نەواز شەریف)، یەکەم پیاوی پاکستانی بۆ خەباتی ئەفغانی ناسراوە.

حکمەتیار بە توندڕەوی و مەبدەئی ناسرابوو، بۆیە لای ئەفغانە عەرەبەکان خۆشەویست بوو، سەیر نییە کە پێش دروستبوونی (قاعیدە)، ئوسامە

عەرەبەکانی تەسلیمی حزبەکەی حکمەتیار دەکردن[1]. دواتر نێوانی حکمەتیار لەلایەك و هەریەکە لە (مەسعود و رەبانی و سەیاف) لەلایەکی ترەوە تێکدەچیّ و دەکەونە شەڕەوە.

(حزبی ئیسلامی) کە حکمەتیار سەرکردایەتی دەکرد، یەکێك بوو لە دوو حزبە گەورەکەی ئەفغان، دەستێکی بالاّی لە لەناوبردنی دۆست و دوژمنانی چ لەناو ئەفغانستان چ لە پاکستان هەبوو، بە بەردەوامی شەڕی جیهادی ئەفغانی و دوژمنایەتی (مەسعود و سەیاف)ی دەکرد، بووە پارتێکی ئۆپۆزسیۆن و هەموو بەشدارییەکی سیاسی و سولّحێکی ڕەتکردەوە و خۆی لە چیاکانی کابولّ قایمکرد و بەڕاست و چەپەوە سەدان موسولّمانی بیّ تاوانی لە هاوپەیمان و شیوعییەکان و شیعەکان دەکوشت.

دوای هاتنی تالیبان، حمکەتیار و سەرجەم دۆست و دوژمنانی ڕاوەدوونران، حکمەتیار بەرەو ئێران چوو، بەلاّم ئێران مامەلّەی دیلی شەڕی لەگەلّدا کرد و بزاوتی سنووردار کرد. بەمەش ژمارەی چەکدارانی لە ٢٠٠هەزار بۆ دوو هەزار کەم بووەوە. هاوپەیمانێتیە زۆرەکانی لەگەلّ ئەملا و ئەولا ڕاستگۆیی لەدەست دا، وایلێهات متمانە لەدەست بدات و پارتەکەی هەلّوەشایەوە، زۆربەی ئەندامانی بەگەلّ تالیبان کەوتن.

---

[1] جریدة الشرق الاوسط. العدد ٩٢٠٣، سنة ٢٠٠٤.

# بەشی سێیەم

# دیاردەی ئەفغانی عەرەبی

**ناساندن:**

ساڵی ١٩٧٨ ساڵێکە بەوەرچەرخانێکی مێژوویی گرنگ لە ژیانی سیاسی ئەفغانییەکان هەژمار دەکرێت، چونکە لەو ساڵەدا کودەتایەکی سەربازی لە ئەفغانستان ڕوویدا و هێزەکانی سۆڤیەتیش پاڵپشتیان لەم گۆڕانکاریە سیاسییە کرد، لەولاشەوە ئەمریکا لە چوارچێوەی یارمەتیدانی (موجاهیدانی ئەفغانی) سیاسەتی لاوازکردنی کۆنە دوژمنەکەی، یارمەتی سیاسی و ماددی پێشکەش بە بەرگری ئەفغانی کرد و میدیا ئەمریکییەکان ناویان لە (موجاهیدانی ئەفغان) نا (شەڕڤانە ئەفغانەکانی پێناو ئازادی-fighters afghan freedom)[١].

چەمکی (ئەفغانە عەرەبەکان) لە سەرەتای دەیەی کۆتایی سەدەی بیستدا بەدەرکەوت، یەکەم بەدەرکەوتنی لە میدیاکانیش لە سەروبەندی ڕووداوە خوێناوییەکانی جەزائیردا بوو[٢]. هەندێکیش پانتاییەکە فراوانتر دەکەن و وڵاتانی میسر و لیبیا و یەمەنیشی دەگەڵ دەدەن[٣]. ئەمەش بۆئەوە دەگەڕێتەوە کاتێ هەندێ دەزگای ڕاگەیاندنی جیهانی باسیان لەو لاوە جەزائیریانە کرد کە بەشداری شەڕی ئەفغان ببوون دژ بە سۆڤیەت و دواتر گەڕابوونەوە جەزائیر بەشداریان لە

---

[1] اسلام اون لاین ٢٠٠١/١٠/٧.

[2] وسام فؤاد، الافغان العرب بين وحدة النهج التربوى و تعددية المناهج الحركية، مركز المستقبل للدراسات والابحاث.

[3] محمد عبدالعاطي، الافغان العرب، المصدر الجزيرة نت.

کردەوە توندوتیژییەکانی جەزائیر کردبوو، ئەوکات بەوانە دەگوترا (ئەفغانە جەزائیرییەکان)[1].

دواتر ئەم چەمکە زیاتر بڵاوبووەوە، بەتایبەت دوای ئەوەی هێزەکانی ئاسایشی میسری چەند ئەندامێکی پارتێکی ئیسلامیان گرت لەوانەی لە شەڕی ئەفغان هاتبوونەوە، ئەو کێشەیە ئەوکات هەرایەکی زۆری نایەوە و لە ڕاگەیاندنەکان بە کێشەی (گەڕاوەکانی ئەفغانستان) ناوزەد کرا[2].

## سەرەتای دەرکەوتنی دیاردەی ئەفغانی عەرەب

سەرەتای دەرکەوتنی ئەفغانە عەرەبەکان بۆ کۆتایی شەڕی ئەفغان لە ساڵی ١٩٩٢ دەگەڕێتەوە[3]، ئەمەش دوای ئەوەی جیهادکردن لە ئەفغانستان بەسەرکەوتنی گەلانی ئەفغانی، هیچ بەهانەیەکی نەما، بۆیە ئەو لاوە عەرەبانەی کە بەمەبەستی شەڕکردن ڕوویان لە ئەفغانستان کردبوو، پێویست بوو زەمینەیەکی تازە بۆ پەرەپێدانی کردەوەکانیان بدۆزنەوە، ئەمانە بەشێکیان بۆ وڵاتەکانیان گەڕانەوە، بەمانە دەگوترا (الافغان العرب).

دوای ئەو ساڵە ١٩٩٢ توێژینەوەکان لە بارەی ئەفغانە عەرەبەکان زیاتربوون و بەسەرجەم ئەو کۆمەڵە لاوە عەرەبانە دەگوترا کە خۆیان بۆ شەڕی سۆڤیەت تەرخانکرد بوو، دوای تەواوبوونی (جیهاد)یش گەڕانەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ هێزەکانی ئاسایشی حکومەتەکانیان[4]. واتە دەبوایە ئەو هێزە مەعنەوی و

---

[1] وسام فؤاد، الافغان العرب، مركز المستقبل للدراسات و الابحاث.

[2] هەمان سەرچاوە

[3] نشأت حامد عبدالماجد، الافغان العرب – محاولة للتعريف – اسلام اون لاين.

[4] وسام فؤاد، الافغان العرب، مركز المستقبل للدراسات و الابحاث.

ماددییەی کە لە ئەزموونی شەڕی ئەفغان بەدەستیان کەوتبوو، لەسەر زەمینەیەکی تازەدا خاڵی بکەنەوە.

کەواتە مەبەستمان لە (ئەفغانە عەرەبەکان) ئەو کۆمەڵە چەکدارە عەرەبە ئەفغانیانەن کە بەشدارییان لە جیهادی دژ بە سۆڤیەت و حوکمی شیوعی لەکابوڵ کردووە و لە سەربازگەکانی پیشاوەر و جەلال ئاباد و قەندەهار و سەربازگەکانی سەرسنووری پاکستان – ئەفغانستان لەنێوان ساڵانی ١٩٧٩-١٩٩٢ مەشقیان بینیوە و بە بیری دامەزراندنی ئیمارەتێکی ئیسلامی گۆشکراون. هەندێ لە ڕۆژنامەنووسان بەوانە دەڵێن (موجاهیدانی بێ سنوور)، (دەوڵەتی ئینتەرناسیۆنال)، (سوپای ئوممەمی)، یان (جەنگاوەرانی بان نەتەوەیی) هەروەها (فرە ڕەگەز) یشیان پێ دەڵێن[1].

* لەم پێناسەیە، دەتوانین چەمك و دیاردەی ئەفغانە عەرەبەکان بەو پێوەرانەی خوارەوە دیاری بکەین:

١- ئەفغانە عەرەبەکان هەر هاووڵاتی وڵاتانی عەرەبی نین، بەڵکو لەو لاوە عەرەب و موسوڵمانانە پێکهاتوون کە پەیوەندییان بە جیهادی ئەفغانەوە کردبوو، دوای گەڕانەوەیان بۆ وڵاتەکانیان دەستیان دایە کردەوەی توندوتیژی سیاسی و شەڕکردن. لەمەشدا سوودیان لەو شارەزاییە سەربازییەی سەردەمی شەڕی ئەفغانستان وەرگرتووە، بۆیە ناکرێت لەگەڵ بزووتنەوەی تالیبان و کۆمەڵە ئەفغانەکانی دیکە تێکەڵاویان بکەین.

٢- زۆربەی زۆری ئەفغانە عەرەبەکان لاون، واتە لە تەمەنێکن لە نێوان (٢٠-٣٠) ساڵاندا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کاتێ ئەمانە ڕوویان لە ئەفغانستان

---

[1] الافغان العرب – محاولة للتعريف – هەمان سەرچاوە، هەروەها الافغان العرب بين وحدة المنهج، هەمان سەرچاوە.

کردووه، تەمەنیان لە نێوان (١٥-٢٠) ساڵاندا بووه، کە ئەمەش قۆناغی گەڵاڵەبوونی فیکرییە لای گەنجان. ئەمانە ساڵانێکی دوورودرێژ لە سەربازگەکانی ئەفغانستان لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکانەوە تا نەوەدەکان مەشقیان لەسەر چەکی گران و سووك پێکراوە، سەرباری ئەوەی ئەمانە لە ڕووی فیکریشەوە تەلقین دراون. ئەم تاکتیکەش یەکێکە لە ڕێبازەکانی سەرجەم ئەو بزاوتە ئیسلامیانەی کە توندوتیژی دەکەنە ئامرازی کارکردنیان.

هەندێ لە توێژەرانی دەروونی وای دەبینن، ئەو لاوە ئەفغانیانە کاتێ چالاکییەکانیان ئەنجام دەدەن هیچ گومانێکیان لە ئەخلاقی بوونی کارەکەیان نییە، لەبەرئەوەی بەبڕوای ئەوان لەڕووی ئایینییەوە سەلمێنراوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی ئەمانە مێشکیان شۆراوەتەوە و لە سەردەمێکی زووی تەمەنیان لە سەربازگەکانی ئەفغانستان تەلقینی فیکری و مەزهەبی دراون.

٣- بونیادی ڕێکخستنی دیاردەی ئەفغانی عەرەب لەسەر دوو لایەن دامەزراوە:

لایەنی بەهاناوەچوون: ئەو لاوە خۆبەخشانە لە چوارچێوەی بەهاناوەچوونی ئیسلامی، کۆمەڵی گەورەی ئەفغانە عەرەبەکانیان پێکهێناوە. ئەوانە بەمەبەستی یارمەتی ئاوارە ئەفغانییەکانی سەرسنووری نێوان پاکستان-ئەفغانستان ڕوویان لە ئەفغانستان کردووە. هەندێ ژمارەی ئەمانە بە (١٣) هەزار کەس دەخەمڵێنن کە زۆربەیان لە دکتۆر و ئەندازیار و مامۆستا و کەسانی دیکە پێکهاتبوون.

لایەنی دووەم، ئەوانەن کە بە مەبەستی جیهادکردن و شەڕکردن دژی سۆڤیەت لە وڵاتانی عەرەب و ناعەرەبی ڕوویان لە ئەفغانستان کردووە. ئەمانە زۆربەیان سەر بە ڕێکخراوە ئیسلامییە سەلەفییەکانن کە هەندێ ژمارەیان بە (٦) هەزار کەس دادەنێن.

٤- ئەفغانە عەرەبەکان، سێ جۆرە ئامادەکارییان لەماوەی شەڕی ئەفغان بینیوە:

أ- مەشق و ئامادەکاریی سەربازی: کە خۆی لە مەشق و ڕاهێنانی سەربازی لە سەربازگەکانی ئەفغانستان لەسەر چالاکی سەربازی و شەڕی پارتیزانی و هەموو جۆرە تەقینەوە و نیشانگەری و تیرۆرکردن دەبینێتەوە.

ب- ئامادەکاریی هەواڵگری: کە خۆی لە تێبینی و چاودێری و خۆگرتن و پەیوەندیکردن و ئاڵوگۆڕی زانیاری و وەرگرتنی ئەرك دەبینێتەوە.

ج- ئامادەکاریی فیکری و ئایدیۆلۆژی: ئەمەیان جەخت لەسەر تەڵقینی دینی و تێگەیشتن لە چەمك و ماناکان و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ حکوومەت و کۆمەڵگاکان و هێزە سیاسی و ئایینییە جۆراوجۆرەکان دەکاتەوە.

٥- شارەزایی و ئەزموون پەیداکردن لە شەڕی ئەفغان وایکرد ئەفغانە عەرەبەکان سوود لە چەند لایەنێك وەربگرن:

أ- لایەنی پەیوەندییەکان: ئەمانە توانیان پەیوەندیەکی بەرفراوان لەگەڵ کۆمەڵە و گروپە ئیسلامییە جیهانییەکاندا دروست بکەن.

ب- لایەنی دارایی: لەو پەیوەندییانە توانیان چەندین دەوڵەمەندی عەرەب بناسن و داوایان لێبکەن یارمەتی دارایی پێشکەش بە شەڕی ئەفغان بکەن.

ج- سوودوەرگرتن لە ژینگەی ئەفغانی بۆ دامەزراندنی چەندین سەربازگەی مەشقی سەربازی.

و- پەیوەندی باشیان لەگەڵ پارت و لایەنە ئەفغانییەکاندا بەست، کە ئەمەش وایکرد چەترێکی هێمن بۆ لاوە ئەفغانییەکان دابین بکەن و، لە چاودێری و تەسلیمکردنەوە بە حکوومەتەکانیان دووربن.

٦- شارەزایی و ئەزموونی پێشتری ئەفغانە عەرەبەکان لەناو کۆمەڵە ئیسلامییەکان بەتایبەت لە جیهادکردندا، کاریگەری لەسەر چالاکی ئەوان هەبووە، ئەو ئەزموونانەش خۆیان لەمانەدا دەبیننەوە:

أ- ئامادەکردنی کادیری جەنگاوەری بەئەزموون.
ب- لێهاتووییان لە کۆکردنەوەی زانیاری و پلاندانان و پێگەی چالاکییەکانیان و دیاریکردنی ئامانج.
ج- گەشەپێدانی توانای پەیوەندیکردن بەناوەوە و دەرەوە.
د-گەشەپێدانی سیستەمی خۆپارێزی ڕێکخستن و پەیوەندیکردن بە سەرکردەکانی ناوەوە و دەرەوە.
ه- بەکارهێنانی کادیری شارەزا لە شەڕی ئەفغانستان و چاندنی ئەو کادیرانە لەناو دەوڵەتی دیکەدا، بە مەبەستی سەرکردایەتی چالاکییەکان و هاوکاریکردنی ئەندامانی ناو دەوڵەتە دیاریکراوەکان، بەمەش بەئاسانی دەیانتوانی چالاکی لە دژی ئەو دەوڵەتانە و بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا بنوێنن.

٧- هەموو ئەوانەی بەشداری شەڕی ئەفغانیان کردووە، بە ئەفغانی عەرەب ناو نابرێن، چونکە هەندێك لەوانە گەڕانەوە بۆ وڵاتەکانیان و لە کاری سیاسی و ئیداری بەشدارییان کردووە و کێشەیان بۆ وڵاتەکەیان نەناوەتەوە، بەڵام هەندێکیش هەن بەشدارییان لە جیهادی ئەفغانی نەکردووە، کەچی لەژێر کاریگەریی فیکری و عەقیدیی ئەوان دان و بەشداری چالاکییەکانی ئەوانیان لە وڵاتی خۆیان یان لە وڵاتێکی دیکە کردووە. دەکرێت ئەوانە لەناو چەمکی ئەفغانی عەرەب پێناسە بکەین.

٨- هەموو ئەوانەی کە لە ئەفغانستان ماونەتەوە لە سەرکردەکانی بزاوتە ئیسلامییەکان، بەڵام بەشداری فیعلی شەڕەکانیان نەکردووە، ئەمانەش لەناو چەمکی ئەفغانی عەرەبدان،، چونکە لەڕووی فیکری و حەرەکی لەوان نزیکن و داوای هەمان گۆڕان دەکەن کە ئەفغانە عەرەبەکان بۆ وڵاتەکانیان داوای دەکەن و، خوازیاری دەرکردنی هێزی کوفرن لە وڵاتەکانیان.

## هۆیەکانی سەرهەڵدانی دیاردەی ئەفغانی عەرەب

بێگومان هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی – سیاسی کۆمەڵێ فاکتەری لە پشتەوە وەستاوە، کە سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوە و فراوانکردنی خێرا دەکات. دیاردەی ئەفغانی عەرەبیش وەك دیاردیەکی سیاسی لە مێژووییەکی نزیکدا، لە ئەنجامی کۆمەڵێ فاکتەری زاتی، بابەتی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی، نەتەوەیی سەریهەڵداوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

یەکەم - ڕۆڵی مەشایخی سەحوە (مشايخ الصحوة)، یان (سەرهەڵدانی ڕابوونی ئیسلامی)[1]:

ئەو ڕەوتە فیکرییە ئایینییە بوو لە دوای شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە سعودیە، لە ئەنجامی هەماهەنگی لەنێوان بەدەستەوەگرتنی بیری وەهابی لە بواری عەقیدە و بیری ئیخوان موسلمین لە بواری سیاسەت، هاتە دامەزراندن. شایەنی گوتنە کە زۆرێك لە بانگەشەکەرانی (اخوان المسلمين) دوای ئەوەی لەلایەن دەسەڵاتدارانی میسرەوە لە سەردەمی (جەمال عبدالناصر) ڕاوەدوونران و پەیوەندی نێوان میسر وسعودیەش خراپ بوو، وایکرد ئەمانە ڕوو لە سعودیە بکەن بە مەبەستێکی سیاسی تێیدا نیشتەجێ بن، کە ئەو کات (اخوان المسلمين) لەژێر کاریگەری توندی نووسینەکانی (سید قوتب)[2] دا بوون.

---

[1] سعود القحطانی، الصحوة الاسلامية السعودية، سایتی ئیلاف.

[2] سید قوتب: لە (صعیدی) میسر ساڵی ١٩٠٦ لە پارێزگای ئەسیوت لە دایکبووە. ساڵی ١٩٥١ دەچێتە ریزی بزووتنەوەی (اخوان المسلمين)، ساڵی ١٩٥٢ کاتێ ڕژێمی پادشایەتی مەلیك فاروق دەڕوخێ (إخوانەکان)ی میسر ڕۆڵێکی باڵایان لەم شۆڕشەدا دەبێ و ئەوکات سید قوتب، سەرنووسەری ڕۆژنامەی (إخوان) دەبێ. لە ساڵی ١٩٥٤ هەوڵی تیرۆرکردنی جمال عبدالناصر لەلایەن (إخوانەکان) دەدرێت و زۆرێك لە (إخوانەکان) دەستگیر دەکرێن، هەر لە هەمان ساڵ (سید قوتب)یش دەگیرێت و بەهەتاهەتایی و کاری سەخت بەند دەکرێت، بەڵام=

لەکاتێکدا (ئیخوانەکان)ی میسر بەنووسینەکانی (سید قوتب) تەیاربوون، کە ڕوویان لە سعودیە کرد، لەوێ ڕووبەڕووی بیری (وەهابی) بەسەرکردایەتیی (محمد سرور بن نایف زین العابدین) بوونەوە، (سرور) سەلەفی وەهابی بوو بەڵام لەژێر کاریگەریی سەید قوتبدا بوو. بیری (سرور) لە باوەشی گەرمی عەقیدەی (حەنبەلی وەهابی) لەدایکبووە.

---

=دواتر لەبەر نەخۆشی، حوکمەکەی بۆ (١٥) ساڵ کەم دەکرێتەوە. شایانی باسە سید قوتب نەخۆشی هەوکردنی سییەکانی هەبوو، لەماوەی بەندکردنیدا، هەردوو سەرۆك وەزیرانی نیجریا (احمد اوبلو) و عێراق (عبدالسلام عارف) لەلای (عبدالناصر) شەفاعەتیان بۆ کردووە، بۆئەوەی ئازاد بکرێت. ئەوەبوو، لە ساڵی ١٩٦٤ کاتێ (عبدالسلام عارف) لە سەردانێکیدا بۆ میسر لەسەر داوای موفتی عێراق (ئەمجەد زەهاوی) داوای لە ناصر کرد سید قوتب ئازاد بکات، ئەویش ئازادی کردو داوای لێکرد بێت بۆ عێراق و ببێتە ڕاوێژکاری تایبەتی خۆی بەڵام ئەوەی ڕتکردەوە. لە ساڵی ١٩٦٥ دووبارە بەتۆمەتی کودەتا بەسەر ڕژێمدا دەستگیر دەکرێت بۆ ماوەی ساڵێك ئازار دراو لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرا، چونکە سید قوتب بەسەرکردەی ڕێکخستنی تیرۆرستی لەقەڵەم درا بوو. ساڵی ١٩٦٦ فرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو، لە هەمان ساڵ فرمانەکەی جێبەجێکرا.

سید قوتب لە ژیانی خۆیدا زۆر نووسینی هەیە لەوانە:

اشواك ١٩٤٧.

مشاهد القيامة فی القرآن ١٩٤٧.

طفل من القرية ١٩٤٦.

الاطياف الاربعة ١٩٤٥.

التصوير الفني فی القرآن ١٩٤٥.

المدينة المحسورة ١٩٤٦.

كتب وشخصيات ١٩٤٦.

النقد الادبی ١٩٤٨.

العدالة الاجتماعية ١٩٤٩.

ڕابوونگەراكانی سعودیە، زیاتر لایەنگیری دەوڵەتن و خودان هەڵوێستێكی سیاسین. وەهابییەكان لە ڕاستیدا دامەزرێنەر و پارێزەری دەوڵەتن، بەپێچەوانەی شێخانی سەحوە كە بانگەشەی هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەوڵەتە كلاسیكییە دەكەن و خوازیارن دەوڵەتێكی ئیسلامی تازە دابمەزرێنن[1].

## ئامانج و بنەماكانی سەحوەی ئیسلامی

ئامانجی ڕابوونی ئیسلامی سعودی ئیلهامی لە شۆڕشی ئیسلامی ئێران وەرگرتووە، دەیەوێت بیرۆكەی ولایەتی فەقیھ (ولایة الفقیه) لە ئێرانەوە بۆ سعودیە بگوازێتەوە. كەواتە ڕەوتی ڕابوونگەری ئیسلامی: بزووتنەوەیەكە دەیەوێت دەسەڵاتێك وەرگرێت كە فوقەها (الفقهاء) پێشەوایەتی بكات. گرنگترین بنەماكانی ئەو ڕەوتە بریتین لە:

١- **گشتگیری ئیسلام** (شمولیة الاسلام): واتە ئیسلام دین و دونیایە. دكتۆر (سفر الحوالی) كە یەكێكە لە پیرانی سەحوەی ئیسلامی دەڵێ: حوكمی خودا سەبارەت بەعەلمانییەت (سكولاریزم)ئەوەیە: ڕژێمێكی تاغوتی جاهیلییە لە دوو ڕووەوە دژی (لا اله الا الله) یە:

أ- لە سەرێكەوە حوكم بەوەی خودا ناردویەتی ناكات.

ب- لە سەرێكی دیكەوە شەریك پەیداكردنە بۆ خودا.

٢- **ملكەچ كردن بۆ عەقیدە نەوەك بۆ نیشتیمان** (الولاء للعقیدة و لیس للوطن): ئەمە ترسناكترین بنەمای ئایدیۆلۆژیایە كە بزاوتی ڕابوونگەری ئیسلامی لەسەری وەستاوە. بەمەش دڵسۆزی بۆ نیشتیمان لە دڵی موریدانی

---

[1] جریدة الحیاة، العدد ١٤٢٤٥، ٢٠٠٢/٣/٢١

خۆی، دەمرێنێ و بە دڵسۆزی بۆ عەقیدەی ئایینی دەیگۆڕێت. لەگەڵ ئەوەی شێخانی سەحوەی ئیسلامی زۆر پێیان خۆش نییە خەڵکی بۆ مەسەلەی جیهاد ڕوو لە وڵاتانی دیکە بکەن، بەو بیانووەی قۆناغی ئێستا قۆناغی بونیادنانی کۆمەڵەیە لەسەر زەوی (ارض الحرمين) - ئەم ناولێنانە ئێستاش لای ڕابوونگەراکان لەجیاتی (شانشینی عەرەبی سعودی) بەکاردێت - هەرچەندە ئەم حەزەی پیرانی ڕابوونگەری تاسەر نابێت، زۆرێك لە موریدان و لایەنگرانیان لەژێر کاریگەری ئەو پەروەردەیە خۆیان پێناگرێت و بۆ جیهاد ڕوو لە شوێنی دیکە دەکەن ، وَئەوەی ئەو بارگاویبوونە لە عەقیدە خاڵی بکەنەوە. بیری نیشتیمانپەروەری لە ڕاگەیاندنی ڕابوونی ئیسلامیدا نییە. سەحوەی ئیسلامی باوەڕیان بە نیشتیمان نییە و هەوڵی لەناوبردنی چەمکی نیشتیمانپەروەری لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتی ئوممە (الدولة الامة) دەدەن. سلمان عودە کە یەکێکە لە پیرانی ڕابوونگەری دەڵێت: (کێشەی ئێمە، کێشەی ئیسلام و موسڵمانانە لە هەموو شوێنێ، پێویستە سنوور و بەربەستی دەستکرد و ئەو پێگەیانەی کە وایکردووە موسوڵمان نەتوانێ یارمەتی برای موسوڵمانی بدات لەناو بچێت).

**٣- دوژمنایەتی ڕۆژئاوا:** شێخانی سەحوە بەبێ ئەوەی باوەڕ بە قسەکانی (سمۆئیل هانتگتۆن)بکەن لەبارەی (ململانێی شارستانییەکان) لەگەڵ بیروباوەڕی ئەودان. باوەڕیان بە دایەلۆگی شارستانییەکان نییە.

سەلمان عۆدە شێخی ڕابوونگەری ئیسلامی دەڵێ: (دەبینین زۆرێك لە مۆسوڵمانان لە دوژمنداریکردنی کافران بێبەری بوون و تێناگەن، لە لایەنگیری و بێبەریکردن (الولاء والبراء) نازانن، بۆیە موسوڵمانێك لەتەك کافر و موشریکێك و شیوعییەك دەبینی و لەگەڵیدا کاردەکات و دەخوا و دەخواتەوە، تەبایی و سۆز لە نێوانیاندا هەیە، هەروەك ئەوەی برا بن، ئەمانە لە جیاوازی دین تێناگەن).

کەواتە بەڕای (عۆدە) جیهادکردن دژی کافران پێویستە، چونکە ئەوان بەردەوام لە پلاندانانداندان بۆ لەناوبردنی ئیسلام، بۆیە هەر دەبێ جیهاد لەدژیان بکرێت.

٤- **خۆسەپاندن بەسەر کۆمەڵگادا:** ڕابوونگەراکان لەو باوەڕەدان کە پێویستە هەیمەنەی خۆیان بەسەر کۆمەڵگادا بسەپێنن و ڕووبەڕووی ڕای گشتی ببنەوە، دووبارە (عۆدە) دەڵێت: (ئێمە پێویستیمان بە بزاوتێکی جیهادی ڕاگەیاندن هەیە بۆ ئەوەی ڕاگەیاندنی ئیسلامی دروست بکات و ببێتە ئەلتەرناتیڤی ڕاگەیاندنی دەسەڵات. بۆیە ئەوان بە دوو ڕێگا کاردەکەن:

أ- هەوڵدەدەن بچنە ناو سەکۆ و ڕاگەیاندنی جیاواز لە خۆیان و بیگۆڕن لە سەکۆیەکی جیاواز بۆ سەکۆیەکی لایەنگری ڕەوتی ڕابوونگەری.

ب- هێرشکردن و ریسواکردنی بیرۆکەی سەرپەرشتیکردنی دام و دەزگای ئایینیی دەوڵەت لەسەر کۆمەڵگا، واتە نابێ دام و دەزگا ئایینییەکان لەلایەن دەوڵەتەوە سەرپەرشتی بکرێن و دەوڵەت قسەی یەکلاکەرەوە لەبارەیانەوە بکات، بەڵکو پێویستە موسوڵمانانی ئاسایی مافی قسە لەسەر کردنی کردەوەی خراپیان هەبێ.

دیسانەوە عۆدە دەڵێ: (لەسەر موسوڵمان پێویستە ئەگەر فەسادێکی بینی لە چەشنی ئەوەی لە ڕۆژنامەکان قسەی خراپ لەدژی ئیسلام و مێژووی ئیسلام دەنووسرێ، ئەوا ئەو موسوڵمانە ئەو خراپەیە ڕەتبکاتەوە و ئابڕوی ئەو کەسە بەرێ کە ئەو کارە دەکات).

لەو بارەشەوە ڕابوونگەران هەموو سەکۆکانی وەك (کاسێت، مزگەوتەکان، وتاری رۆژی هەینی، وانەی نامەنهەجی لە قوتابخانەکان، ئینتەرنێت) بۆ بەرژەوەندی خۆیان قۆرغ بکەن، بۆ ئەوەی گوتارێك بۆ خۆیان لە نێوەندە ڕۆشنبیری و پەروەردەیی و فکرییەکان دروست بکەن.

ئەم سەکۆ و کەنالانە چەکێکی گرنگی دەستی ڕابوونگەراکانە، بەهۆیەوە هێرش دەکەنە سەر ئەوانەی دژایەتیان دەکەن و جیاوازن لێیان.

بەمەش بیرباوەڕ و ڕۆشنبیریی خۆیان بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنن. بەمەش وا دێتە بەرچاو کە ڕەوتی ڕابوونگەری ئیسلامی سعودی بۆ خۆی حزبێکی سیاسی سەربەخۆی نارەسمی و تاکە ئۆپۆزسیۆنی گۆڕەپانەکەیە. ئەو ڕێکخستنەی ڕابوونگەراکان لەم دواییەدا دروستیان کردووە، زۆر شارەزایە و هێزی خۆی لە گەلێك سەرچاوە وەردەگرێت وەك:

أ- ئەزموونی ئیخوانەکان: کە لایەنێکی هاوکێشەکە بوون و ڕابوونگەراکان لەسەری دامەزراون و بەتایبەت لە بواری سیاسی، سوودیان لێوەرگرتووە.

ب- سروشتی کۆمەڵگای سعودی، کۆمەڵگایەکی خۆ پارێزە، هاوسۆزی بۆ هەرکەسێك دەکات کە بەناوی ئایینەوە قسە بکات. وەك دەزانین ئایین تاکە سەرچاوەی ڕۆشنبیریی کەمەڵگای سعودییە.

ج- تاکرەوی بێ هاوتای ڕابوونگەراکانی سعودیە لە گۆڕەپانی حزبی لە سالانی دواییدا.

## دووەم - ڕەوشی سیاسی جیهانی و دابەشبوونی بەسەر دوو بلۆکدا

وەك پێشتر باسمانکرد، خاکی ئەفغانستان لە ساڵی ۱۹۷۹ لەلایەن هێزەکانی سوپای سووری سۆڤیەتەوە داگیرکرابوو، ئەوکاتیش ئەمریکا لەگەڵ سۆڤیەت لە پێشبڕکێدا بوو بۆ باڵکێشان بەسەر جیهاندا. هەریەکە نوێنەرایەتی ڕێباز و ئایدیایەکی تایبەت بەخۆیان (سۆسیالیزم - کاپیتالیزم)یان دەکرد. بۆیە سەیر نییە گەر ئەمریکا خۆی لە خەباتی چەکداری ئەفغانەکان نزیك کردبێتەوە و هەوڵیدابێت یارمەتی دارایی و سەربازی و لۆجیستی ئەم بزووتنەوەیەی دژی

سۆڤیەتی دابێ[1]، هەروەك هەندێ سەرچاوە باسیان کردووە، ئەمریکا ڕاستەوخۆ ئەم یارمەتی و پاڵپشتییەی بۆ هێزە ئەفغانەکان پێشکەش نەکردووە، بەڵکو لە ڕێگای حکوومەتەکانی پاکستان و وڵاتانی کەنداو بەتایبەت سعودیە و کوێت، لە نزیکەوە چاودێری و سەرپەرشتی گۆڕانکاری و گەشەسەندنەکانی شەڕی ئەفغانی دژ بە ڕووسیا کردبێ.

لە خاڵی یەکەمدا گوتمان لە سعودیە و وڵاتانی کەنداو ڕەوتی جیهادی سەلەفی لە ڕێگای پیرانی ڕابوونگەرییەوە لە تەواوی ئەو وڵاتانەدا گەشەی سەند. ئەم گەشەسەندنە پێویستی بە شوێنێك هەبوو، بۆ ئەوەی ئەو بارگاوییبوونە بە بیروباوەڕ و جیهاد خاڵی بکرێتەوە، ئەفغانستانیش بۆ ئەو کات باشترین زەمینە بوو کە لاوانی ئەو وڵاتانە لە ئامێز بگرێت. حکوومەتەکانی ئەو وڵاتانە لە ئاست ئەو کۆچە بەردەوامەی لاوان بۆ جیهادکردن بەرەو ئەفغانستان نەوەك هەربێ دەنگ دەبوون، بەڵکو ئاسانکاریشیان بۆ دەکردن، بێگومان ئەمە بەبێ ئاگاداری ئەمریکییەکانەوە، نەدەکرا، بەڵکو بەبەرچاوی ئەوانەوە ئەنجام دەدرا. ئەمریکییەکانیش لەمەدا، ئامانجیان بوو هێزەکانی ڕووس و دەوڵەتی سۆڤیەت بە شەڕێکەوە خەریك بکەن، کە دەرچوون لێی زەحمەت بێ.

لێرەدا باشترین نموونە بەقسەیەکی خودی (ئوسامە بن لادن) دەهێنینەوە کاتێ گوتی: (ئەفغانە عەرەبەکان فەزڵیان بەسەر ئەمریکییەکانەوە هەیە، چونکە بەهۆی ئەوانەوە بوو، هێزەکانی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٨٩ لە ئەفغانستان شکان و ئەمریکا بووە تاکە هێزی دونیا، ئێستاش ئەمریکا بەرانبەر بە ئەفغانە عەرەبەکان بێ وەفا دەرچوو). کەواتە لەنێوان ئەفغانە عەرەبەکان و ئەمریکییەکاندا سەین و بەینێك هەبووە، بۆیە ئوسامە گلەیی دەکات و داوای وەفاداری لە ئەمریکییەکان دەکات.

---

[1] محمد عبد العاطي، الافغان العرب، الجزيرة نت.

## سێیەم - ڕۆڵی ڕێکخراوە خێرخواز و یارمەتیبەخشە عەرەبییەکان

لەگەڵ داگیرکاری هێزەکانی سۆڤیەت بۆ خاکی ئەفغانستان و بڵاوبوونەوەی هەواڵی داگیرکاری دەوڵەتێکی موسوڵمان لەلایەن دەوڵەتێکی کافر (شیوعی)!، هەست و سۆزی شەقامی عەرەبی بەرانبەر ئەم ڕووداوە، زوو بەدەرکەوت. ئەوە بوو هەلمەتێکی فراوانی یارمەتی و کۆمەك لە وڵاتانی دەوڵەمەندی کەنداو بۆ ئەفغانە لێقەوماوە موسوڵمانەکان کۆکرایەوە و لە ڕێگەی چەند شاندێکەوە بەرەو ئەفغانستان بەڕێکەوت[1]. هەروەك لە ژیانی ئوسامە بن لادندا باسمان کرد سەرەتای ئەو یارمەتیانە لەرێگای چەند نووسینگەیەك و ڕێکخراوێکی خێرخوازی و یارمەتیبەخشەوە دەستی پێکرد، لە نێوانیشیاندا دەوڵەمەندی سعودی (ئوسامە بن لادن) و (عەبدوڵڵا عەزام)کە یەکێکیان (نووسینگەی خزمەتگوزاری) و ئەوی دیکەیان خانەی ئەنسار (بيت الانصار)ی دامەزراند.

لە ڕێگەی ئەم دامەزراوە خێرخوازییانەوە کۆمەڵێ کەس ڕوویان لە ئەفغانستان کردووە و بۆتە بیانوویەك کە هاتووچۆیەکی بەردەوام لەنێوان ئەفغانستان و ئەو وڵاتانەدا بە بەردەوامی هەبێ[2].

## چوارەم - ئەفغانستان وەک پەناگەی کەسانی یاساغ و هەڵاتوو

ئەفغانستان دوای داگیرکاری بووە شوێنێك کە ئاژاوەی سیاسی تێدا دەرکەوت و هەروەها بێ یاسا و بێ دەسەڵات مایەوە، هێزە چەکدارەکان دەسەڵاتیان بەسەر لایەکی ئەفغانستاندا دەڕۆیشت و حکوومەتی سەر بە سۆڤیەت لەناو پایتەخت و شارەکان دەسەڵاتی هەبوو، ئەم ڕەوشەش ژینگەیەکی لەباری بۆ ئەو کەسایەتییە

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] روهان جوناراتانا، القاعدة من الداخل.

ئیسلامییانە هێنایە پێش کە لەلایەن حکوومەتەکانی خۆیانەوە یاساغ بوون، تاوەکو ڕوو لە ئەفغانستان بکەن و سوود لەو ڕەوشە وەربگرن و کەسایەتی سیاسی و ئیسلامی خۆیان پەرەپێ بدەن[1].

لەوانەیە ئیسلامییەکانی میسر لەم بارەیەوە بەشی شێریان بەرکەوتبێ و زۆرترین ئیسلامی میسری ڕوویان لە ئەفغانستان کردبێ، دوای ئەوەی حکوومەتی میسر تەنگی بە ئیسلامییەکان و ڕێکخراوی جیهاد و ئیخوان هەڵچنی. سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ٧٠٪ ی ئەفغانە عەرەبەکان خەڵکی میسرن، دەوڵەتی سعودیش دوای هەڕەشەکانی ئەمریکا بەپلەی دووەم دێت.

## پێنجەم- سەرهەڵدانی دیاردەی ئەفغانی عەرەب لە چوارچێوەی نێوخۆیی و هەرێمایەتی و نێودەوڵەتیدا[2]

أ- هۆکاری نێوخۆیی بۆ سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیە. کێشەی ئەفغانی لە ساتەوەختێکی مێژووییدا، بووە نموونەیەکی بێ هاوتای کێشەی ئیسلامی کە ئەم خەسڵەتانەی لەخۆ گرتبوو:-

١- کێشەی گەلێکی موسوڵمان کە لە مێژوودا کەوتووەتە نێو بەرداشی ململانێی گەورە هێزەکانی دونیا (بەریتانیا و ڕووسیا) دواتر (ئەمریکا و سۆڤیەت)، گەلەکەشی بەهەموو شێوەیەك بەرگری لە بوونی خۆی کردووە.

٢- حاڵەتی جیهادکردنی خەڵك دژ بەداگیرکەران لەو وڵاتەدا بەردەوام بووە.

---

[1] محمد عبدالعاطي، الافغان العرب، الجزيرة نت.

[2] د.نشأت حامد عبدالماجد، الافغان العرب، اسلام اون لاين.

٣- ململانێ لەنێوان گەلێکی موسوڵمان کە دەست بەرداری ئیسلامەکەی نابێت و هێزێکی داگیرکەر کە خوازیار بووە ئەو خەسڵەتە ئیسلامییە لەم گەلە بسەنێ.

ب- هۆکاری هەرێمایەتی عەرەبی و ئیسلامی: لەسەر بنەمای ئەوەی لەسەرەوە باسکرا، کێشەی ئەفغانی وەك کێشەیەکی ئیسلامی ناسێنرا، بۆیە لەلایەن وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامییەوە یارمەتی درا، دەکرێت ئەم یارمەتییانەش لە دوو ئاستدا دیاری بکەین:

١- ئاستی فەرمی (رسمي): پاڵپشتی سیاسی لە نێوەندە نێودەوڵەتی و عەرەبی و ئیسلامییەکان، دوای ئەوەی بەهاندانی ئەمریکا بڕیارێك لە نەتەوە یەکگرتووەکان دەرچوو، سەرکۆنەی داگیرکاری سۆڤیەتی کرد. هەر لەم چوارچێوەیەدا وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی ئیسلامی لەنێوان ٢٧-٢٩ تەمووزی ساڵی ١٩٨٠ کۆبوونەوەیەکی لەناکاویان گرێداو، ئەوانیش داگیرکاری سۆڤیەتیان مەحکومکرد و داوای کشانەوەی بەپەلەی هێزەکانی ڕووسیان کرد لە ئەفغانستان، هەروەها کۆبوونەوەکە بڕیاریدا یارمەتی لێقوماوانی ئەفغان بدات. هەر لەوکاتەوە، کێشەی ئەفغانی لە سەرووی ئەو کێشانەوە بوو کە لووتکەی وڵاتانی ئیسلامی باسیان لێوە دەکرد، بەڵام بە شێوەیەکی فەرمی و تۆمارکراو لە (کۆنگرەی فاس ١٩٨٦)، کۆنگرەکە بڕیاریدا یارمەتی بەرگری ئەفغانی لەپێناو ڕزگاری بدات و پارێزگاری لە سەربەخۆیی و ناسنامە ئیسلامییەکەی بکات.

ساڵی ١٩٨٩ بەدەستپێشخەری سعودیە لە کۆنگرەی وەزیرەکانی وڵاتانی ئیسلامی بڕیاردرا، حکوومەتی موجاهیدان شوێنی حکوومەتی ئەوسای کابوڵ لە ڕێکخراوی وڵاتانی ئیسلامی بگرێت، بەبێ ئەوەی دان بنرێت بەو حکوومەتە. هەرچەندە پاڵپشتی عەرەبی و ئیسلامی بۆ کێشەی ئەفغانی پاڵپشتییەکی ڕووکەشانە بوو، کەچی ڕۆڵی هەریەکە لە سعودیە و پاکستان ڕۆڵێکی گرنگ بووە، پاکستان بارگرانی هەرە گەورەی سیاسی و سەبازی و مرۆیی لە کێشەی

ئەفغانستان بەرکەوتووە، سنوورەکانی لە هەرێمی (پیشاوەر) بەڕووی (٥) ملیۆن پەنابەری ئەفغانی کردەوە، بەشێك لە زەوییە سنوورییەکانی بوونە گۆڕەپانی شەڕەکان، ئەو شوێنانەی کە دواتر دیاردەی (ئەفغانی عەرەبی) تێدا سەری هەڵدا.

هەرچی حکوومەتی سعودیەیە پاڵپشتی جیهادی ئەفغانی لەڕووی ماددی و لوجستی لە ڕێگەی پەیوەندییە ڕاستەوخۆکانیەوە، کردووە. میسریش لە ڕێگەی (دەستەی عەرەبی بۆ پیشەسازی) چەك و تەقەمەنی و کەلوپەلی سەربازی و پاڵپشتی سیاسی و ڕەسمی پێشکەش کردووە. هەروەها ڕێگەی بەکۆکردنەوەی کۆمەك و یارمەتی داوە و پرۆسەی خۆبەخشینی لەبەردەم هاووڵاتیانیدا ئاسان کردووە. لە ڕاستیدا ئاستی نافەرمی بنەمایەکی گرنگی دروستبوونی دیاردەی ئەفغانی عەرەب بووە، بەڵام بەپلەیەکی بەرز سوودی لەو پاڵپشتییە وەرگرتووە کە لەسەر ئاستی ڕەسمی پێشکەش کراون، ئەو پاڵپشتیانەش کە زۆربەی کات لە ڕێگەی دامەزراوە نیمچە فەرمی و حکومییەکانەوە هاتووە کە ئەرکی کاری بەهاناوە هاتنی لە ئەستۆ گرتبوو، لەگرنگترین ئەو دامەزراوانەش:

مانگی سووری سعودی، لیژنەی بانگەوازی ئیسلامی، مانگی سووری کوێتی، دامەزراوی ئیغاسەی ئیسلامی، رابیتەی جیهانی ئیسلامی، لیژنەی خێری ئیسلامی، مانگی سووری ئیماراتی، ئاژانسی ئیسلامی بۆ بەهاناوەهاتن (اسراء) و نووسینگەی خزمەتگوزاری عەرەبی، ئەمانە ڕێکخراوگەلێکی نیمچە ڕەسمی حکومی بوون، هەریەکە لەمانە مۆڵەتی کردنەوەی لقیان لە (پیشاوەر) پێدرا. ئەمەش بەدرێژکراوەی ئەو ڕێکخراوانەی دەرەوەی ئەفغانستان دەژمێردران کە لەژێر سەرپەرشتی دەوڵەتەکانیان و بەهەماهەنگی حکوومەتەکانیان و بەپاڵپشتی گەلانی ئەو حکوومەتانە کاریان دەکرد، زۆربەی زۆری ناساندن و هاتنی لاوە عەرەبە ئەفغانەکان لە ڕێگەی ئەم ڕێکخراوانە بووە.

٢- ئاستی نافەرمی (غير رسمي) کە ڕۆڵی لە دروستبوونی دیاردەی (ئەفغانی عەرەب) هەبووە:

ئەم ئاستە بە بنچینەی دروستبوونی ئەفغانە عەرەبەکان دادەنرێت و دەتوانرێت بیکەین بەدوو بەشەوە:

**یەکەم**- ئەوانەی لەبواری بەهاناوە چوون، فێرکردن و ڕاگەیاندن کاریان دەکرد.

**دووەم**- ئەوانەی لە گۆڕەپانی شەڕ ئامادەبوون، بێگومان ناکرێت بوونی پەیوەندی لەنێوان ئەم دووبەشە ڕەت بکرێتەوە. گومان لەوەدا نییە لەنێوان ئەوانەی لە گۆڕەپانی شەڕەکان ئامادە دەبوون کەسانی وایان تێدا هەبووبێ کە حەزیان دەکرد لە بواری بەهاناوەچوون و ڕاگەیاندندا ڕۆڵی هەبێ، کە زۆرجار جیاوازیکردن لەنێوان ئەم دوو تیپە زەحمەت دەبوو، بەڵام گرنگە جیاوازی لەنێوان ئەمانەدا بکەین، گروپی یەکەم کە بەکاری بەهانەوەچوون هەڵدەستان، زۆربەیان لە بزووتنەوە ئیسلامییە میانڕەوەکان، بەتایبەت ئیخوانولموسلمین و سەربەخۆکان بوون، هەرچی گروپی دووەمن کە جەختیان لەسەر شەڕکردن و مەشقی سەربازی دەکردەوە، ئەمانە زۆربەیان ئەندامی کۆمەڵە ئیسلامییە توندڕەوەکان بوون.

لە بۆشایی نێوان گروپی بەهاناوەچوون و گروپی شەڕکەر فەزایەك بۆ دروستبوونی دیاردەی (ئەفغانی عەرەب) دروست هاتە ئاراوە. بۆ زیاتر تێگەیشتن لە کار و کردەوەکانی هەردوو گروپەکە لە چاچێوەی کێشەی ئەفغانی، لێرەدا بە درێژی باسی هەریەکەیان دەکەین.

أ- گروپی یەکەم: لەچوارچێوەی کارکردنی یارمەتیدان (بەهاناوەچوون)ی نارەسمی: لێرەدا دەکرێت ئاماژە بە ڕۆڵی سەندیکای پزیشکانی میسری بدەین، کە لە سەرەتای هەشتاکانەوە کۆمەڵی (إخوان) لە ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنیدا زاڵ بوون، ئەم سەندیکایە پاڵپشتی دارایی پێشکەش کردووە، دەستەیەك لە دکتۆری شارەزای بۆ ئەفغانستان ناردووە، ئەم سەندیکایە یارمەتی مرۆیی پێشکەش بە سەندیکاکانی ئیسلامی بەهاناوەچوونی حکومی کردووە. ئەم سەندیکایە لە ساڵی ١٩٨٤ تاکو سەرەتای نەوەدەکان لە چالاکی دابووە. هەروەها (إخوان) شێوەی دیکەی پاڵپشتیان پێشکەش کردووە، وەك کۆکردنەوەی کۆمەك و دارایی،

ناردنی شارەزایان بۆ سەرکردەکانی جیهاد، ناردنی دکتۆر و مامۆستا لە تەواوی دونیا، ڕێکخستنی کۆڕو کۆبوونەوەی جەماوەری، هەروەها میدیاگەلێکیان بۆ ئەم مەبەستە خستەگەڕ لە ڕۆژنامە و گۆڤار وەك ڕژنامەی (الدعوة)و (لواء الاسلام)ی میسری و (الاصلاح الاماراتية) و(المجتمع)ی کوێتی، هەروەها بەهۆی بنکە ئیسلامییەکانی ئەوروپا و ئەمریکا، وێڕای ئەوەی دامەزراوی (الاغاثة) و (لیژنەی بانگەوازی ئیسلامی)یان دامەزراندن و گرنگیان بە دروستکردنی قوتابخانە و پەیمانگا لە خێوەتگاکانی (پیشاوەر) دا. چەند پەیمانگایەکی بالاّیان لە چەشنی (پەیمانگای شەرعی)و زانکۆی (الدعوة والجهاد)یان لە دەوروبەری پیشاوەر کردەوە.

ئیخوانەکان سووربوون لەسەر ئەوەی بە ڕێکوپێکی سەرکردە ئەفغانییەکان ببینن بۆ ئەوەی یەکگرتوویان بکەن، لەمەشدا (کەمال سەنانیری) سەرکەوت لە کۆکردنەوەی سەرانی ئەفغانی لە ساڵی ١٩٨٠ لە مەککەی پیرۆز، لەو کۆبوونەوەیەدا سەرانی ئەفغانی ڕازی بوون لەسەر ئەوەی دەستبەرداری پێشەوایەتی کردنی ڕێکخستنەکانی خۆیان بن و لەژێر چەتری ڕێکخستنێکی یەکگرتوو بەناوی (یەکگرتووی ئیسلامی بۆ جیهادکردن لە ئەفغانستان) کاربکەن. ئەم ڕێکخراوە تازەیە سەرجەم ڕێکخراوە ناکۆکەکانی ئەفغانی لە سەروی هەموویانەوە (عبد رب الرسول سیاف) لەخۆ کۆکردەوە، بەلاّم دوای چەند مانگێگ ئەم ڕێکخراوە هەڵوەشایەوە و (سەنانیری) لە ڕەوشێکی نادیار دوای ئەوەی لە کۆتایی دەسەڵاتی سادات لە ساڵی ١٩٨١ دەستگیردەکرێت، لە بەندیخانە دەمرێت. دوای ئەمەش هەوڵەکانی (ئیخوان) بۆ نێوبژی نێوان لایەنە ناکۆکەکانی ئەفغان و حکوومەتی پاکستانی بەردەوام دەبێ. سەلاح شادی لە ساڵی ١٩٨٩ هەوڵێکی لەم چەشنە لە ڕێگەی پاکستانەوە دەدات، بەلاّم لایەنە ئەفغانییەکان ئەمە ڕەت دەکەنەوە.

ب- گروپی دووەم: سەربازگری و دروستبوونی ڕاستەقینەی ئەفغانی عەرەب:

وەك باسمان كرد ڕەوشی ئەفغانستان وەك دەوڵەتێكی موسوڵمانی داگیركراو لەلایەن هێزێكی لادینی شیوعی وایكرد لاوانی خۆبەخش لە سەرجەم دونیا بۆخۆی كێش بكات، بەو ناوەی (جیهاد) فەرزێكە لە فەرزەكانی ئیسلام، لەلایەكی دیكەوە زانا ئیسلامییەكانی میسر و سعودیە و پاكستان ڕۆڵێكی گەورەیان لە ئامادەكردنی ئەو لاوە خۆبەخشانەدا بینیوە. بەتایبەتی لاوی عەرەبی بۆ جیهادكردن لە ئەفغانستان. هەریەكە لە شێخی ئەزهەر و زانا ئیسلامییەكانی وەك (عبدالعزیز بن باز) و (سعید حوی) و(عبدالله علوان) و (المطیعي) و(عبدالمجید الزندانی) بانگەوازی ئەوەیان كردووە كە پاڵپشتیكردنی جیهادی ئەفغانی پێویستە و جیهادكردنیان بە فەرزێكی بەرجەستە جاڕدا، ئەمەش وایكرد هەزارەها خۆبەخش كە زۆربەیان عەرەب بوون بۆ جیهادكردن ڕوو لە ئەفغانستان بكەن، گەرچی زۆربەیان لە بواری یارمەتی و بەهاناوەچوون كاریان دەكرد، چەند هەزارێكیان بۆ بەرەكانی شەڕچوون. بەشداری عەرەبەكان لە جیهادی ئەفغانی لە نیوەی دووەمی هەشتاكان بەرەو زیادبوون چوو، لە نێوان ساڵانی ١٩٨٧ تا ١٩٨٨ ئەم بەشدارییە گەیشتە لوتكە، كە هەندێك بە دوو هەزار كەس مەزەندەی دەكەن، گرنگترین ئەو شەڕانەی كە عەرەبە ئەفغانەكان بەشداریەكی كارایان تێداكرد، شەڕی (جاجی) بوو، كە لە ساڵی ١٩٨٧ ڕوویدا، هەروەها شەڕی (جەلال ئاباد)كە نزیكەی (٧٠) عەرەبی تیاچوو، هەروەها شەڕی (مأسدة الانصار)كە لە ساڵی ١٩٨٧ ڕوویدا، لەگرنگترین ئەو شەڕانە بوو كە ئەفغانە عەرەبەكان بەشداریان تێدا كردووە.

لەلایەكی دیكەوە ئامادەبوونی عەرەبی لە جیهادی ئەفغانی سلبیاتی خۆشی هەبووە. دیارترینیان گواستنەوەی ناكۆكی و ململانێی نێوان كۆمەڵە ئیسلامییەكان بوو بۆ ناو ئەفغانستان، بۆ نموونە ئەو دەمەتەقێیەی لە نێوان ڕەوتی میانڕەو و ڕەوتی توندڕەودا هەبوو. ڕێكخستنی جیهاد (تنظیم الاجهاد) ی میسری كە (أیمن الظواهری) سەركردایەتی دەكرد، وای دەبینی كە (ئیخوانەكان)

مەیلی ئاشتەوایان زیاترە و لە شەڕکردن دوور دەکەونەوە، زیاتر بەکاری یارمەتیدان و بەهاناوەچوون و خزمەتگوزاری خۆخەریك دەکەن. هەرچی کۆمەڵەی جیهاد و جەماعەی ئیسلامی میسرییە لەو باوەڕەدان بوون کە شەڕکردن لەپاڵ موجاهیدانی ئەفغانی تاکە ڕێگای پشتیوانیکردنی ئەفغانە. ئەمە خاڵی سەرەتای دەرکەوتنی ئەفغانی عەرەب و گۆڕینی ناوی (موجاهیدانی عەرەب)بۆ (ئەفغانی عەرەب)بوو.

## هۆکارەکانی گۆڕینی ناوی (موجاهیدانی عەرەب) بۆ (ئەفغانی عەرەب)

یەکەم: دەرچونی هێزەکانی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٨٩ لە ئەفغانستان و، کەوتنی حکوومەتی کابوڵ ساڵی ١٩٩٢ و تەقینەوەی ململانێی توند و شەڕی ناوەخۆ، کە سەرەتا لە نێوان (حکمتیار و ڕەبانی و شاە مەسعود) ڕوویدا و تاکو هاتنی بزووتنەوەی تالیبان بەردەوام بوو. ئەم ڕەوشە نوێیە وایکرد بەهانەکانی خۆبەخشە عەرەبەکان نەمێنێ. دوای ئەم ڕەوشە ئیدی جیهادکردن نەما تاکو عەرەبەکان پاڵپشتی بکەن، بەڵکو ئەوەی هەیە شەڕی نێوەخۆ و فیتنەیە (بە تێگەیشتنی ئیسلامی).

کاتێ عەرەبەکان بەشداریان لەم شەڕانەدا کرد، ئیدی پێیان نەگوترا (موجاهیدانی عەرەب)، بەڵکو بوونە (ئەفغانی عەرەب)، ڕۆڵەکەیان بەگوێرەی فیقهی ئیسلامی ئەو بەهانانەی لە دەست دابوو، ئەمانە (واتە ئەفغانە عەرەبەکان) پێش ڕووخانی حکوومەتەکەی (نجیب الله لە ساڵی ١٩٩٢) بەم شێوەیە بەسەر حزب و لایەنە ئەفغانییەکاندا دابەش ببوون:

- حزبی ئیسلامی (حکمتیار)٦٠٠ عەرەبی ئەفغانی لابوو.
- یەکگرتووی ئیسلامی (سیاف) ٥٠٠ عەرەبی ئەفغانی لابوو.
- جمعیة اهل الحدیث (مولای جمیل رحمان) ٣٠٠ ئەفغانی عەرەبی لابوو.

لە شەڕی نێوان لایەنە ناکۆکەکانی ئەفغان دەیان کەس لە ئەفغانە عەرەبەکان کوژراون بەتایبەتی لە شەڕی نێوان (حکمتیار) و (برهان الدین رەبانی و شاە مەسعود)، ئەفغانە عەرەبەکان لایەنگری (حکمتیار)یان کرد کاتێ دروشمی (دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی) بەرزکردەوە، کەچی دژەکەی (شاە مەسعود)یان بە نەیاری دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە دەبینێ. لە کۆتاییدا هەندێکیان لە ئەفغانستان نیشتەجێ بوون بۆ پارێزگاریکردن لەمانەوەیان بوونە چەکداری ئەم لاو ئەولا، بەتایبەتی دوای ئەوەی بێ ئومێد بوون لە گەڕانەوە بۆ وڵاتەکانیان.

دووەم: هاتنی هەندێ لە سەرکردەکانی هەردوو بزووتنەوەی (الجهاد والجماعة الاسلامیة)ی میسر لە ناوەڕاستی هەشتاکان بۆ ئەفغانستان، لەبەرئەوەی گۆڕەپانی ئەفغانی بەڕای ئەوان مەیدان و هەلێکی مێژووییە بۆ مەشقی سەربازی. لەنێوان ئەم سەرکردانەش (ئەیمەن زەواهیری) بوو، کە لە یەکەمینەکانی ئەو کەسانە بوو لە ساڵی ١٩٨٥ هاتە ئەفغانستان، ئەمەش دوای ئازادبوونی لە بەندیخانە لە میسر. بەیەکێ لە دامەزرێنەرانی جیهادی ئەفغانی دادەنرێت. زەواهیری چاوی بە ئوسامە بن لادنی دەوڵەمەندی سعودی دەکەوێت، ئەو پیاوەی دەیەوێت پاڵپشتی لە جیهادی ئەفغانی بکات. بن لادن وەك زەواهیری لە سەرەتادا خوازیاری گۆڕان بەزەبری هێز نەبوو، بەڵکو زیاتر لە تێڕوانینی (ئیخوانەکان) نزیك بوو. عەبدوڵڵا عەزام داوای لە ئوسامە کرد چەند سەربازگەیەك بۆ موجاهیدانی ئەفغان دروست بکات، لە ناویشیان سەربازگەی (الخلافة) بوو، کە زۆرینەی ئەفغانی میسرییەکان بەناویدا گوزەریان کردووە. ماوەی ساڵانی ١٩٨٧ تا ١٩٩٤ کۆچێکی بەکۆمەڵی زۆربەی سەرکردەکانی (الجهاد والجماعة الاسلامیة)ی میسری بەخۆیەوە بینیوە، وەك (رفاعی احمد طه – ١٩٨٧) و (محمد شوقی الاسلامبولی) و (مصطفی حمزة ١٩٨٨) بەم شێوەیە وایلێهات کۆنترۆڵکردنی خۆبەخشە عەرەبەکان بۆ جیهادی ئەفغانی ئەستەم بێت.

میسریەکان کاتێ دەگەیشتنە (پیشاوەر) لە (بیت الانصار) یان (بیت القاعدة) کۆدەبوونەوە، دواتر بەسەر سەربازگە جیاجیاکانی ئەفغانستان دابەش دەکران. کۆمەڵی ئیسلامی میسری (الجماعة الاسلامية المصرية) سوربوو لەسەر ئەوەی کە دەبێ سەربازگەی تایبەت بەخۆی هەبێ، ئەوە بۆ ساڵی ١٩٨٩ سەربازگەی (الخلافة)یان دامەزراند، کە تەوزیفکردنی ئەو ڕەوشە لەلایەن (الجماعة الاسلامية)وە دەگەیەنێ، هەروەها مەشق کردن لەسەر چالاکییەکان هیچ پەیوەندی بەبەرەی شەڕی ئەفغانەوە نەبووە.

# بەشی چوارەم

# بیرکردنەوەی ئەفغانە عەرەبەکان

لەوانەیە زەحمەت بێ چوارچێوەی فیکری (ئەفغانە عەرەبەکان) لە تەواوی ئەو گروپە ئیسلامییانە جیابکەینەوە کە توندوتیژی سیاسی یان جیهادکردن لە هەڵوێستەکانیاندا بەدەردەکەوێت، دیاربکەین. ئەمانەش وەك باقی پارتە ئیسلامییە سیاسییەکان قورئان و سوننەتی پێغەمبەر وەك سەلەفی ساڵح کردویانە، دەکەنە پەیڕەوی خۆیان و بانگەشەی بۆ دەکەن، بەڵام ئەوە ئەمە ناگەیەنێ کە هەڵوێست و کاروکردەوەکانیان، هەڵوێست و کارو کردەوەی شەرعین و شایەنی پابەندبوونە پێی.

چوارچێوەی فیکری ئەفغانە عەرەبەکان و فۆرمەلەبوونی بیرباوەڕیان بۆ دوو قۆناغ دەگەڕێتەوە، قۆناغی پێش چوونە ئەفغانستان و قۆناغی دوای چونیان:

أ- قۆناغی بەر لە چوونیان بۆ ئەفغانستان: ئەمەش خۆی لەو باکگراوندە فیکری و کولتووری و عەقیدەییە دەبینێتەوە، کە ئەوانە بەر لە چوونیان بۆ ئەفغانستان هەڵگری بوون، چونکە وەك لەبەشەکانی پێشتر باسمان کرد، زۆربەی ئەفغانە عەرەبەکان بەر لەچونیان بۆ ئەفغانستان یان سەر بە پارت و گروپێکی ئیسلامی بوون و هەر لە ڕێگای ئەوانەوە هاندراون، یان لەو لاوە ئیسلامییە سادانە بوون کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەو فەزایە ئیسلامییەی لەو وڵاتانەدا لەئارادا بوو. بە شێوەیەکی گشتی ئەفغانە عەرەبەکان بەر لە چوونیان بۆ ئەفغانستان زۆربەیان سەربە هێڵی فیکری سیاسی جیهادی سەلەفی (الجهاد السلفی)بوون[1]، لێرە گرنگە بزانین فیکری جیهادی سەلەفی چییە؟

---

[1] د.نشأة حامد عبدالماجد، الافغان العرب محاولة للتعریف، اسلام اون لاین، هەروەها سەیری محمد عبدالعاطي، الافغان العرب، الجزیرة نت بکە.

## بیروباوەڕی جیهادی سەلەفی:

ابو محمد ئەلمەقەددەسی، کە یەکێکە لە دیارترین دامەزرێنەران و بانگەشەکەرانی ڕێبازی جیهادی سەلەفی لە ئوردون، لە زۆرێك لە نووسینەکان و چاوپێکەوتنەکانی تیشکی خستۆتە سەر ئەم ڕێبازە، لە یەکێ لە چاوپێکەوتنەکان[1]، بەم شێوەیە پێناسەی ئەم ڕێبازە دەکات: (بانگەوازکردنی خەڵك بۆ یەکتاپەرستی، کە یەکێکە لە مافەکانی خوداوەند لەسەر بەندەکانی ئێمەش هەوڵی نزیککردنەوەی خەڵك دەکەین بۆ ئەم ڕەوتە، لەم پێناوەشدا جەخت لەسەر کەموکوڕییەکانی یەکتاپەرستی هاوچەرخ دەکەینەوە، وەك نابێ جگە لەخودا کەسی دیکە یاسا بۆ مرۆڤـ دابنێ، دەستگرتن بە یاساکانی زەوی و کارنەکردن بەحوکمی خودا، لە حاکمیەتی خودا دوورمان دەخاتەوە، حاکمیەتی خودا بەشێکی سەرەکی یەکتاپەرستییە)[2].

دووەم: بنەمای تەیاری سەلەفی جیهادی تێگەیشتنە لە چەمکی (الولاء والبراء)، ئەلمەقەددەسی لەم بارەیەوە دەڵێت: (لە ئەرکە هەرە لە پێشەکانی باوەڕدارانە کە خۆی بێبەری بکات (البراء) لەوانەی کە جگە لە خودا شتی دیکە دەپەرستن، کە لە کۆندا (بەرد و بت) بوون، بەڵام لە سەردەمی ئێستا خۆی لە دەسەڵاتداران و یاسادانەران و یاساکانی سەر زەوی دەبینێتەوە، لەبەرانبەردا، پێویستە بڕوادار ملکەچی و پاڵپشتی و لایەنگری (الولاء) خۆی بۆ خودا و یاساکانی بسەلمێنێت)[3].

لەلایەکی دیکەوە (شێخ حەمودی کوڕی عەقلانی ئەلشوعیبی) سەبارەت بە (الولاء والبراء) و پێویستی لایەنگیرکرن بۆ بزووتنەوەی تالیبان دەڵێت:

---

[1] مجلة العصر – حوار خاص لە ٢٠٠٥/٧/٢٤ بلاوکراوەتەوە.

[2] هەمان سەرچاوە

[3] هەمان سەرچاوە

(الولاء)له شەرعدا واتە لایەنگریکردن بۆ خودا و پێغەمبەر و ئەولیاکانی خوا و جێبەجێکردنی فرمانەکانیان و ڕەتکردنەوەی ئەوەی ئەوان بە خراپیان داناوە... هەرچی (البراء)ە واتا پچڕاندنی هەموو پەیوەندییەك بەکافرانەوە، نابێ خۆشمان بوێن و لایەنگریان بکەین و لە خاکیاندا نیشتەجێ بین [1]

سێیەم: کۆڵەگەی بیری جیهادی سەلەفی (جیهادکردنە): بەڕای شێخ ئەلموقەددەسی جیهادکردن ئەوەیە کار بۆ یەکتاپەرستی بەسەلماندنی لایەنگری خۆت بۆ خودا و بێبەری بوونت لە کوفر ڕابگەیەنی و کار بۆ جێبەجێکردنی بکەیت، بە شێوازی بانگەشەکردن یان (شەڕکردن) بێت.

کەواتە بیری جیهادی سەلەفی سێ کۆڵەگەی سەرەکی هەیە ئەوانیش:١- بانگەوازکردن بۆ یەکتاپەرستی (التوحید)،٢- جاڕدانی لایەنگری و بێبەری بوون (الولاء والبراء)، ٣- جیهاد کردن (الجهاد). زۆربەی زۆری عەرەبە ئەفغانەکان پێش چوونیان بۆ ئەفغانستان هەڵگری ئەو بیروباوەڕانە بوون).

ب- قۆناغی دوای چوونیان بۆ ئەفغانستان: ئەوانەی کە لە تەمەنێکی زوو بەر لە دروستبوونی بیروباوەڕ چوونەتە ئەفغانستان دەگرێتەوە، هەروەها ئەوانەش دەگرێتەوە کە خودان بیروباوەڕێکی ڕوون و ئاشکرا نەبوون. لەم قۆناغەدا پرۆسەی دروستبوون و گەڵاڵەبوونی فیکری ئەفغانە عەرەبەکان لە ئەنجامی ئەو چالاکیە سیاسی و تەڵقیندان و بارگاویکردنە عەقائیدییەوە، هاتووە، کە ئەو لاوە عەرەبانە لە سەرەتاکانی شەڕی ئەفغان و دەورانی دواتر لە سەربازگەکانی ئەفغانستان بەدەستیان هێناوە. هەروەها لێرەدا نابێ ڕۆڵی ڕاگەیاندنی عەرەبی و زانا ئیسلامییەکان، ئەوانەی فتوای جیهادکردنیان لە ئەفغانستان دەرکردووە، لەبیر بکەین.

ئەو لاوانە دوای ئەوەی بەلێشاو ڕوویانکردە ئەفغانستان لە سەربازگەکانی ئەفغانستان لەپاڵ مەشقی سەربازی و مەدەنی، وانە و دەرسی فیکریشیان بەچڕی

---

[1] منتدى السقيفة.

پێ دەدرا، بەتایبەت لەڕووی دروستکردنی بیرباوەڕێکی پتەو، بۆ ئەوەی بتوانن لە بەرانبەر هەموو هەڵوێستێکی لەناکاو خۆڕاگربن.

دەکرێت ڕەگەزە سەرەکییەکانی تێروانینی فیکری ئەفغانە عەرەبەکان لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە[1] :-

١- ڕژێمی حوکم (دەوڵەتەکان) لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی، ڕژێمێکی کافر و ناشەرعییە، لایەنگیری دوژمنانی ئیسلام (لە یەهود و نەساری) دەکات و دژایەتی (دوژمنداری) شەریعەتی ئیسلام و ئەوانەی داوای جێبەجێکردنی دەکەن، دەکات.

٢- جیهادکردن و شەڕکردن بە ئامرازێکی بنچینەیی بۆ گۆڕینی حاکمان و حکوومەتە عەرەبی و ئیسلامییەکان دادەنێت، بۆیە جیهادکردن بە فەرزێکی (عەین) پێویست لەسەر هەموو موسوڵمانان دادەنرێت و تاکو ئەو ڕژێمانە بگۆڕن.

٣- پێویستە هەموو مامەڵە کردنێك لەگەڵ دامەزراوە حکومییەکان وەك (چوونە ناو پەرلەمان یان دروستکردنی پارتی سیاسی) ڕەت بکرێتەوە، چونکە ئەمە دەبێتە پاڵپشت بۆ ئەو حکوومەتانە و لەناو نابرێن، بەڵام دەکرێت مامەڵە لەگەڵ دامەزراوەی عەسکەری بکرێت، بۆ ئەوەی تواناکانی ئەو دامەزراوە بۆ لەناوبردنی ئەو ڕژێمە بەکاربهێنرێت.

٤- هەندێ لە ئەفغانە عەرەبەکان باوەڕیان بە ڕێگاچارەی کودەتای سەربازی (الانقلاب العسكري) هەیە بۆ وەرگرتنی دەسەڵات، هەندێکی تر باوەڕیان بە شۆڕشی گەلان هەیە، گروپی سێیەم لە باوەڕەدان کە پێویستە ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداری دژ بەو ڕژێمانە سازبکرێت بۆ ئەوەی فشاری بخەیتە سەر تاکو ئامانجەکان جێبەجێ بکات.

---

[1] محمد عبدالعاطي، الافغان العرب، سەرچاوەی پێشوو.

٥- پرەنسیپی (کاکردن بەچاکە و رەتکردنەوەی خراپە) پرەنسیپێکی گرنگی ئەفغانی عەرەبە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکانی کۆمەڵگا و دەوڵەت لەیەك کاتدا. ئەوان وای دەبینن، کە هەموو موسوڵمانێك لەسەریەتی ئەو پرەنسیپە جێبەجێ بکات بەبێ ئەوەی مۆڵەت لە دەوڵەت وەربگرێت، مادام ئەو موسوڵمانە بەدیهێنانی مەرجە شەرعییەکان لەو بابەتە بەڕاست دەزانێ.

٦- شەڕکردن دژی ئەوانەی ڕێگری لە جێبەجێکردنی شەرعیەتی ئیسلام دەکەن، بەواجب دەزانن.

٧- کوشتنی کەسی بێتاوان یان موسوڵمان لەکاتی شەڕکردنی کافران و ئەوانەی لێناگەڕێن حوکمی خودا لەزەوی بکرێت، بەڕەوا دەزانن، چونکە ئەوان لەو باوەڕەدان ئەگەر تایفەیەکی بێتاوان یان موسوڵمان کەوتە ناو تایفەیەکی کافر نابێت لەبەر خاتری ئەو بێتاوانانە ڕێگری لە جیهاد (شەڕکردن) بکرێت، پێویستە شەڕی هەمووان بکرێت، ئەوانەی لەم شەڕەدا دەکوژرێن بەنیەتی خۆیان لە ڕۆژی دوایی لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت[١].

٨- مرۆڤەکان و کۆمەڵگاکان و دەوڵەتان بۆ دوو گروپ دابەش دەکەن، گروپێك بە موسوڵمان و گروپێکی دیکە بە کافر، ئەوان ئەمریکا بە سەرکردەی ئەو دەوڵەتانە دەزانن کە پێویستە شەڕی لەگەڵدا بکرێت لەپاڵ ئەوانەی لە بازنەی هاوپەیمانێتی کوفردا دەخولێنەوە.

٩- بیروڕای ئەفغانە عەرەبەکان سەبارەت بە دیاریکردنی دوژمن لەنێوان هەندێك لەو لاوانە جیاوازی هەیە، هەیانە ڕژێمی حوکمی وڵاتەکانیان بەلادەر (منحرف) لە ئیسلام دەزانن و شەڕکردن لە دژیان بەواجب دەزانن، لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەو دایەلۆگەی نێو پارتە ئیسلامییەکان لەم بارەیەوە بدەین لەمەڕ شەڕکردن لەدژی دوژمنی نزیك و دوژمنی دوور هەروەك لە باسی ژیانی (ئەیمن زەواهری)دا باسمان کرد. سەرەتا بزووتنەوە ئیسلامییە

---

[1] محمد عبدالعاصی، الافغان العرب، الجزیرة نت.

توندڕەوەکانی میسر شەڕێکی گەرمی حکوومەتی میسریان کرد بۆیە (زەواهری) ڕایگەیاند کە: (ڕێگەی ڕزگاری قودس لە قاهیرەوە دەست پێدەکات)بەڵام دوای ئەوەی هێزەکانی ئاسایشی میسری زەبرێکی کوشندەیان لەو پارتانە دا و زۆریان لێگرتن و کوشتن، ئەوانە دووبارە بەخۆیاندا چونەوە، ئەمجارەیان دروشمیان بۆ شەڕکردن دژی دوژمنی دوور گۆڕی، واتە (ئەمریکا و جولەکە)، چونکە ئەوانەن پاڵپشتی سەرەکی مانەوەی ئەو ڕژێمانەی ئەوان شەڕیان لەگەڵدا دەکەن. کە دواتر ئەو شەڕەیان بەشەڕکردن دژ بە دوژمنی ناڕاستەوخۆ ناوزەدکرد. هەندێکی دیکەیان وای دەبینن شەڕکردن بەگوێرەی حاڵەتی جیهادی سەردەم لێبگەڕێ، واتە ئەگەر لە ئەفغانستان جیهاد پێویست بوو، ئەوا لەسەر موسوڵمانان پێویستە ڕوو لەوێ بکەن و جیهاد لەوێ بکەن، یاخود لەکەشمیر یان چیچان یان بۆسنە یان هەر شوێنێکی دیکە کە جیهادی پێویست بێت.

١٠- ئەفغانە عەرەبەکان جاهیلیەتی نوێی ڕۆژئاوایی لەبەر ماددی بوون و کوفر، ڕەتدەکەنەوە. لای ئەوان دیموکراسی بیرێکی جاهلییە، چونکە لە هەناوی کۆمەڵگای خۆرئاوایی بەدرێژایی مێژووی ئەغریقی دروست بووە، لەبەرئەوەی ڕژێمی دیموکراسی هەوڵی سەپاندنی دەسەڵاتی زۆرینە ئەگەرچی ناڕەواش بێت، دەدات. دیموکراسی مافێکی ڕەها بە مرۆڤ دەدات بۆ دانانی یاسا، بۆیە هیچ پەیوەندیەك بە هیچ کلۆجێك لەنێوان دیموکراسی و شورای ئیسلامیدا نییە.

١١- ئەفغانە عەرەبەکان بەتەواوی بیری نەتەوەیی و نیشتیمانپەروەری ڕەتدەکەنەوە، لەبەرئەوەی پەیوەندییەکی زەمینی جاهلییە، موسوڵمانان خاوەنی هیچ ڕەگەزنامەیەك نین تەنها ڕەگەزنامەی عەقیدە نەبێ، لەسەر ئەم بنەمایە ئەوان دان بە بیرۆکەی (عقد الذمة)وەك بنچینەیەك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کەمینەکانی نێو یەك دەوڵەتی ئیسلام، دەنێن.

١٢- ئەفغانە عەرەبەکان عەلمانییەت (سیکۆلاریزم)بەبیرێکی ڕۆژئاوایی دژ بەئیسلام و ئایین دادەنێن، ڕۆژئاوا دەخوازێت عەلمانییەت لە شوێنی ئایین (ئیسلام) لە کۆمەڵگادا پەیڕەوبکات، بۆیە یاسا دانراوەکان بەکوفرێکی ڕوون دادەنرێن.

١٣- لە کێشە خیلافییەکان (ناکۆکەکان) بەلای ئەوەدا دەچن، کە دەلیلی شەرعی هەروەك سەلەفی سالّح کردوویانە، ئەوانیش بیکەن.

١٤- باوەڕیان بە دامەزراندنی (خەلافەتی ئیسلامی) هەیە. بەڕای ئەوان پێویستە خەلیفە قورەیشی بێت.

بەم شێوەیە بیری ئەفغانی عەرەب، درێژکراوەی هەمان بیری بزاوتە ئیسلامییە جیهادییەکانە، ئەمەش سروشتیە، چونکە ئەوانە باکگراوندی ئەو ڕەوتە ئیسلامیانەن و سەران و سەرکردەکانیان هەمان سەران و سەرکردەی کۆمەڵە ئیسلامییەکانن کە دەکرێت پێی بڵێین (ڕەوتی جیهادی سەلەفی). ئەو چوارچێوەیە بەگشتی هاوشێوەی چوارچێوەی فیکری کۆمەڵ و ڕێکخستنە ئیسلامییەکانی پێشویانە، نووسینەکانی (ابن تیمیة، ابن رجب الحنبلی، محمد بن عبدالوهاب و ابن کثیر) بە سەرچاوەیەکی فیکری ئەوان دادەنرێت.

هەرچی سەرچاوە فیکرییە نوێیەکانی ئەفغانە عەربەکانە خۆی لە نووسینەکانی (سید قطب و محمد قطب و ئەبو الاعلی المودودی، حسن البنا) دەبینێتەوە.

# بەشی پێنجەم

# دامەزراندنی ڕێکخراوی (قاعیدە)

## پێشەکی

لە بەشەکانی ڕابردوو، باسمان لەوە کرد کە چۆن لێشاوی لاوە عەرەبەکان بەنیەتی جیهادکردن ڕوویان لە جیهادکردن لە ئەفغانستان دژ بە هێزەکانی سۆڤیەت کرد، هەروەها ئەو هۆکارانەشمان باسکرد کە وای لەو لاوە عەرەبانە کردووە کە بەو بیروباوەڕانەیانەوە ئەو کۆچە بەکۆمەڵە بەرەو ئەفغانستان بکەن. بۆ تێگەیشتن لەو فەزا سیاسی و عەقائیدیەی کە وای کردووە، ڕێکخراوی قاعیدە دروست ببێ، پێویستە ڕوناکی بخەینە سەر ئەو زەمینە فیکری و سیاسیانەی کە لە دنیای ئیسلامی لەلایەك و دنیای ئەفغانی لەلایەکی دیکەوە، لەئارادابوون.

لەڕاستیدا (ڕێکخراوی قاعیدە)پێناسەکەی هەرچیەك بێت، گەشەسەندنە مێژووییەکەی هەر چۆنێك بێت لە نەخشەی بزاوتە ئیسلامییە جیهادییە نێودەوڵەتیەکانی دیکە دەرناچێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بیرو چالاکی ئەو ڕیکخراوە ئیسلامییە، جیهادکردنە بەئاراستەی دوژمنی دەرەکی، نەوەك شەڕکردن دژ بە ڕژێمە عەرەبی و ئیسلامییەکان هەروەك بزاوتە ئیسلامییە لۆکاڵییەکان دەیکەن (میسر و جەزائیر). کەواتە کاری لە پێشی قاعیدە جیهادکردنە دژ بە دوژمنی دوور نەوەك دوژمنی نزیك، بیرۆکەی شەڕکردن دژ بە دوژمنی دوور (دەرەکی) کرۆکی بیری ڕێکخستنی قاعیدە پێکدێنێ. ئەم بیرۆکەیەش لەگەڵ دروشمی (هاوکاری و پاڵپشتی جیهانی ئیسلامی لەپێناوی ڕزگارکردنی هەر پارچە زەوییەکی موسوڵمانان کە لەلایەن داگیرکەری بیانییەوە داگیر دەکرێت، زەرورییە).

سەرەتاکانی بیرۆکەی دامەزراندنی قاعیدە بۆ دەست پێکردنی داگیرکاری سۆڤیەت بۆ ئەفغانستان لە ساڵی ١٩٧٩ دەگەڕێتەوە. بیرۆکەی شەڕکردن دژ بە دوژمنی دەرەکی (دوور)، چ لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چ لەلایەن وڵاتە ئیسلامییە عەرەبییەکانەوە، بانگەشەی بۆ دەکرا و ئاسانکاری بۆ دەکرا و دەڕازێنرایەوە. جیهادی دەرەکی (دوور) لەکاتی ئاشتیدا بۆ جیهادی بەرگری (دفاعی) و جیهادی هێرشکردن (هجومی) دابەش دەکرێت، جیهادی بەرگریش لەسەر هەموو موسوڵمانێك پێویستە بەرگری لە بیرباوەڕ (عقیدە) و ئایینەکەی لە هەر هێرشێکی دوژمنی دەرەکی بکات، جیهادی هێرشکردنیش لەسەر دەوڵەتانی موسوڵمان پێویستە بۆ ئەوەی گەلان و هەرێمی دیکە بخاتە سەر ئۆمەتی ئیسلامی[1]. وەك بەدەرکەوت کە چەمکی جیهادی بەرگری، ئەو فەلسەفەیە بوو کە بیری عەرەبە ئەفغانەکانی لەسەر وەستا بوو، دواتریش لە درێژایی ژیانی قاعیدە، ئەم بیرۆکەیە ئامادەبوو.

## ئەوانەی یەکەم بەردی بناغەی قاعیدەیان دامەزراند

چەند کەسایەتییەکی سیاسی، ئایینی، ئابووری، عەقیدەیی، ڕۆڵێکی گەورە و بەرچاویان لە دروستبوونی ڕێکخراوی قاعیدەدا هەبووە، لەوانە عەبدوڵڵا عەزام، کە لە ساڵی ١٩٨١ ڕوو لە ئەفغانستان دەکات، بۆئەوەی سەرپەرشتی ئەو ئەفغانە عەرەبانە بکات کە بەمەبەستی جیهادکردن ڕوویان لەو وڵاتە کردووە[2]. ساڵی ١٩٨٤ نووسینگەی خزمەتگوزاری (مكتب الخدمات) دادەمەزرێنێ[3]. وەك

---

[1] معالم في الطريق العنف والمراجعة: الجماعة الاسلامية – تنظيم الجهاد – القاعدة – تأليف ضياء رشوان، مركز الاهرام للدراسات السياسية والاستراتيجية.

[2] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٩٣٣٦، سنة ٢٠٠٢.

[3] هەمان سەرچاوە.

له بەشی یەکەمدا باسمانکرد، ئەو نووسینگەیە ڕۆڵێکی گەورەی لە هاندان و مەشقکردن و کۆکردنەوەی کۆمەك و دارایی بۆ خەباتی ئەفغانی بینی.

نووسینگەی خزمەتگوزاری ئەو عەرەبە ئەفغانانەی لە خۆ کۆکردەوە کە لە شێوەی یەکەم ڕێکخستنی سادە و بەردی بناغەی ڕێکخراوی قاعیدە دەژمێردرێت، هەروەها عەبدوڵلا عەزام لەساڵی ١٩٨٦ یەکەم سەربازگەی بەناوی (صدا) بۆ مەشقکردنی لاوە عەرەبەکان کردەوە[١]. کردنەوەی سەربازگەی (صدا) دووەم هەنگاوی دامەزراندنی قاعیدە دادەنرێت، چونکە پێش کردنەوەی ئەم سەربازگەیە، پەرتەوازەییەك و ناڕێکیەك بەکۆکردنەوە و ناردنی لاوە عەرەبەکانەوە دیاربوو.

لە نێوان ساڵانی ١٩٨٤ تا ١٩٨٨ عەزام و ئوسامە زۆر لە یەك نزیك دەبنەوە، کاری جیهادی لەنێوان خۆیان دابەش دەکەن، عەزام گرنگی بەلایەنی فیکری جیهادی دەدا و ئوسامەش بەلایەنی عەمەلی (کرداری) جیهاد دەدا.

دووەم کەسایەتی کە قاعیدەی پێ دەناسرێتەوە (ئوسامە بن لادن)ە، ئەم پیاوە کوڕی دەوڵەمەندێکی سعودی بوو، دوای مردنی باوکی بەپێی هەندێ سەرچاوە نزیکەی (٣٠٠) ملیۆن دۆلاری بۆ بەجێ دەمێنێ، کە ئەمەش وا دەکات لە دامەزراندنی قاعیدە دەستێکی باڵای هەبێ، لەپاڵ ئەو بیرە جیهادە سەلەفیەی کە پێش هاتنی بۆ ئەفغانستان هەڵیگرتبوو. ئوسامە ساڵی ١٩٨٢ بۆ ئەفغانستان دەچێت[٢]. ئەوکات تەمەنی ٢٥ساڵ دەبوو. ساڵی ١٩٨٤ یەکەم نموونەی کاری دامەزراوەیی جیهادی عەرەب لە ئەفغانستان لە چوارچێوەی دامەزراندنی (بیت الانصار)دا، لەلایەن ئوسامەوە بەدەرکەوت[٣]، (بیت

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] القاعدة من الداخل.

[3] شبكة فلسطين للحوار.

الانصار)یش لەپاڵ نووسینگەی خزمەتگوزاری (مکتب الخدمات) و سەربازگەی (صدا) پایەکانی ڕێکخراوی قاعیدەیان دامەزراند. (بیت الانصار) دامەزراوەیەك بوو کە ئوسامە تایبەت بەخۆی دایمەزراند، وەك وێستگەیەك بۆ پێشوازیکردن لەو لاوە عەرەبانەی بەمەبەستی جیهاد ڕوویان لە ئەفغانستان کردووە، کرایەوە. ساڵی ١٩٨٦ ئوسامە بڕیار دەدات چەند سەربازگەیەکی تایبەت بە خۆی هەبێ، لە ماوەیەکی کورتدا شەش سەربازگە لەناو ئەفغانستان دروست دەکات. ساڵی ١٩٨٨ ئوسامە تۆماری بنچینەیی (سجل القاعدة)بۆ ناونووسکردنی چەکدارە عەرەبەکان دادەنێت کە دواتر دەبێتە ناوی ڕێکخراوی قاعیدە، ئەو تۆمارە ناونیشان و پیشەو شوێنی نیشتەجێبوون و مێژووی هاتن و شەهیدبوونی لاوە عەرەبەکانی تێدا تۆماردەکرا.

کەسایەتی سێیەم کە لەوانەی پێشووتر ڕۆڵی کەمتر نییە، بەڵکو هەندێ وای بۆ دەچن هاتنی (ئەیمەن زەواهیری)بۆ ناو هاوکێشەی ئەفغانی، پرۆسەی دروستکردنی ڕێکخراوی قاعیدەی خێراکرد و بووە بنەمایەکی سەرەکی ئەو ڕێکخراوە. زەواهیری ساڵی ١٩٨٠ بۆ یەکەمجار سەردانی ئەفغانستان دەکات و بەزەمینەیەکی لەباری گەشەی بزاوتی جیهادی ناوی دەبات[١].

- زەواهیری کە سەرکردەیەکی دیاری ڕێکخراوی جیهادی میسری بوو ئەزموونێکی زۆری سەرکردایەتیکردن و ڕێکخستنی لا کۆببووەوە، ئەمەش وایکرد زوو لە ئوسامە نزیك ببێتەوە، وەك زۆرێك لە توێژەران دەڵێن: دوای یەکەم چاوپێکەوتنی ئوسامە و زەواهیری، لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٨٦ هەر زوو ئوسامە کەوتە ژێر کاریگەری زەواهیرییەوە.

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٩٠٢٣، سنة ٢٠٠٤.

## قۆناغەكانی دروستكردنی ڕێكخراوی قاعیدە

باگراوندی دروستبوونی ڕێكخراوی قاعیدە دەگەڕێتەوە بۆ:

أ- عەبدوڵڵا عەزام و دروستكردنی نووسینگەی خزمەتگوزاری و سەربازگەی (صدا).

ب- ئوسامە بن لادن و دروست كردنی (بیت الانصار و سەربازگەكانی و تۆماری بنچینەیی (سجل القاعدة)).

ج- هاتنی ئەیمەن زەواهیری وەك سەركردەیەكی بەئەزموونی لاباڵی جیهادی سەلەفی شۆڕشگێڕ.

ئەم پایە سەرەكییانەی قاعیدە پێش دروستكردنی بەرە هاوبەشەكەی نێوان ئوسامە و زەواهیرییە لەساڵی ١٩٩٨بووە. كەواتە قۆناغی شەڕی ئەفغان بریتیە لە (نووسینگەی خزمەتگوزاری و سەربازگەی صدا و بیت الانصار و سجل القاعدە و ئەزموونی جیهادی سەلەفی)، ئەم قۆناغە لە سەرەتای شەڕی ئەفغان ١٩٧٩ تاكو كۆتایی شەڕ لە ساڵی ١٩٨٩ دەخایەنێ. لەم قۆناغەدا هێشتا ڕاگەیاندنی ڕێكخراوی قاعیدە و بنەماو چوارچێوە فیكرییەكەی بەئاشكرا ڕوون نەبۆتەوە، ئینجا قۆناغی دوای كۆتایی شەڕی ئەفغان و گەڕانەوەی ئەفغانە عەرەبەكان بۆ وڵاتەكانیان دەست پێدەكات. ئەم قۆناغە كاریگەر دەبێ بە باڵادەستی ئەمریكا بەسەر ناوچەی كەنداودا، دوای پرۆسەی داگیركاری عێراق بۆكوێت، ئەم قۆناغە كۆتایی ساڵی ١٩٨٩ و سەرەتای ساڵی ١٩٩٠ و، تاكو ساڵی ١٩٩٨ دەخایەنێ.

لەم قۆناغەدا، ئوسامە بن لادن بۆ سعودیە دەگەڕێتەوە، كوێت لەلایەن عێراقەوە داگیردەكرێت و وڵاتە عەرەبیەكان بۆ ڕزگاربوون لە هەڕەشەی (صدام حسین)پەنا بۆ ئەمریكا دەبەن و ئەمریكا بەهێزێكی زۆرەوە دێتە ناو نیمچە دوورگەی عەرەبی. لەم قۆناغەدا بیرۆكەی جیهادی خاریجی (دەرەكی) بەسەر ئوسامە و زۆرێك لەوانەی بەشداری شەڕی ئەفغانیان كردووە، زاڵ دەبێت. هەوڵ

دەدەن هەمان ئەزموونی ئەفغان بەڵام لە بەرانبەر دوژمنێکی تازە (ئەمریکا) دووبارە بکەنەوە.

لە ماوەی ئەو ساڵانەی کە ئوسامە لە سعودیە و دواتر لە سودانی بردەسەر تاکو ساڵی ١٩٩٥، بیری جیهادی ڕێکخراوی قاعیدە ڕوون نەبوو. ساڵی ١٩٩٦ لەژێر فشاری ئەمریکی ئوسامە لە سودانەوە بۆ ئەفغانستان دەگەڕێتەوە. ساڵی ١٩٩٧ ئوسامە لە ئەفغانستان دەستی دایەوە چالاکی سیاسی لەپاڵ زانا ئیسلامییە ئەفغانییەکان و لە ژێر چەتری بزووتنەوەی تالیبان.

قۆناغی سێیەم ساڵی ١٩٩٨ تاکو ئێستا دەخایەنێ، بەڵام ئەم قۆناغەش بەدوو سەردەم دا دەڕوات. سەردەمی دروستکردنی ڕێکخراوەکە و ئاشکرانەکردنی ناوی ڕێکخراوەکە. ئەم سەردەمە لە ساڵی ١٩٩٨ دەست پێ دەکات کاتێ هەریەکە لە (ئوسامە بن لادن و ئەیمەن زەواهیری بە ناوی ڕێکخستنی جیهادی میسری و رفاعی احمد تەها بە ناوی کۆمەڵی ئیسلامی میسری و میر حمزە نوێنەری کۆمەڵەی زانایانی پاکستانی و فەزل ئەلرەحمان سەرۆکی (حرکة الانصار)ی پاکستانی و عبدالسلام محمد سەرۆکی (حرکة الجهاد)ی بەنگلادیشی بەیانی جاڕدانی (بەرەی ئیسلامی جیهانی بۆ جیهادکردن دژی یەهودی و خاچپەرستان- الجبهة الاسلامیة العالمیة لجهاد الیهود و الصلیبین)یان مۆرکرد و لەم بەیانەدا فتوای شەڕکردن لەدژی ئەمریکییەکان و هاوپەیمانی ئەمریکی چ هاووڵاتی بن یان سەرباز درا و بەواجبێکی سەرەکی سەرشانی هەموو موسوڵمانێك ڕاگەیەندرا[1]، لە هەر شوێنێ کە بۆی بلوێ.

ئەم کەسایەتیانە هەریەکە لە بری ڕێکخراوەکەی خۆی ئەو بەیانەیان مۆرکرد، شایەنی باسە بەیانەکە مۆری ئوسامەی بەسەرەوە نەبوو، ئەگەرچی لەبەشداربووانی ئەو بەرەیەش بوو. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هێشتا ئوسامە نەیویستووە، ناوی ڕێکخراوی قاعیدە بە ڕەسمی لە ڕاگەیاندنەکان ئاشکرا بکرێت،

---

[1] معالم في طريق العنف، هەمان سەرچاوەی سەرەوە.

هەرچەندە قاعیدە لەم سەردەمەدا دوو چالاکی گەورەی ئەنجامدا، بەڵام بە شێوەیەکی فەرمی لەلایەن قاعیدە باس نەکران. ئەوانیش تەقاندنەوەی هەر دوو قونسوڵگەری ئەمریکی لە کینیا و تەنزانیا لەساڵی ١٩٩٨ بوو، کە جگە لە سەرچاوە ئەمریکییەکان هیچ ڕێکخراوێکی دیکە ناوی قاعیدەیان نەهێنا، ئەمەش لەوانەیە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە هێشتا ناوی ئەو ڕێکخراوە بەتەواوی جێگیر نەبووبێ.

سەردەمی دووەم، لە ساڵی ٢٠٠٠ دەست پێدەکات، کاتێ ڕێکخراوی قاعیدە لە ٣٠ ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٠ هێرشێکی کردە سەر کەشتیگەلی ئەمریکی (S.S.COL -ئێس ئێس کۆڵ) لە کەنارەکانی یەمەن، بەڵام لەمەشدا قاعیدە ئەم ڕووداوەی بەفەرمی ئەوکات نەخستە ئەستۆی خۆی، تاکو ڕووداوی ١١ی سێپتێمبەر هات و هێرشی ئەمریکی بۆ سەر ئەفغانستان لە ساڵی ٢٠٠١ دەستی پێکرد. بۆ یەکەمجار لە تەلەفزیۆنەکان ئوسامە وەك سەرۆکی قاعیدە و ئەیمەن زەواهیریش وەك قسەکەر بەناوی ئوسامە و ئەبو غەیس کە تا ئێستاش نەزانراوە چ سیفەتێکی لەو ڕێکخراوەدا هەیە، بەدەرکەوتن، ڕێکخراوی قاعیدە لەلایەن دامەزرێنەرانیەوە ڕاگەیەنرا. دوای ئەمە، ئیدی سەرکردەکانی قاعیدە لە میدیاکان بەدەردەکەوتن و بەناوی (قاعدة الجهاد) قسەیان دەکرد.

# ڕێکخستنەکانی ڕێکخراوی (قاعیدەی جیهاد)[1]

ڕێکخستن و ئەنجامدانی چالاکییەکان لەناو ڕێکخراوی (قاعیدە) لە تەواوی ڕێکخراوە ئیسلامی و گروپە تیرۆرستییەکانی دیکە جیاوازە. بەدەرخستنی ژێرخانە ڕێکخستنیەکەی زۆر زەحمەتە، ئەمەش لەبەرئەوەی قاعیدە ڕێکخراوێکە ئایدیۆلۆژیا دەیهاژۆت و بونیادێکی فراوانی هەیە و توانایەکی لە ڕادەبەدەر زۆری خۆنوێکردنەوە و بەرهەمنهێنانەوەی هەیە. ئەمە لەپاڵ ئەو سیستەمە هەمەڕەنگەی ئەندامگیری کە سنوورەکانی ئەتنی و نەتەوەیی دەبڕێ. ئەو ڕێکخراوە نە کۆبوونەوەی تاکەکان و نە هاوپەیمانی کۆمەڵەکانە.

ئەو ڕێکخراوە لە چەند بنکەیەکی مەرکەزی لە ئەفغانستان و چەندین شانەی پاشکۆ لە هەموو دونیا پێکدێ. ئەم ڕێکخراوە دامەزرێنەر و کۆکەرەوەی ژمارەیەك لە پارتی ئیسلامی سیاسی کە تاڕاددەیەك ئەمانە سەربەخۆن لەکارکردن، لەنێوان سەرکردە مەیدانییەکان لەلایەن سەرکردایەتی ئاڕاستەکردنی ستراتیژیی سەرۆك بۆ ئەو کۆمەڵانە دادەنرێت، ئەمانەش بە شێوەی سەرکردایەتییەکی ئاسۆیی کاردەکەن.

هێز و توانای (قاعیدە)لەسەر جێگۆڕکێ و گواستنەوە و خۆنوێکردنەوە لە کۆتایی ١٩٩٨ بەدەرکەوت، کاتێ بنکە و بارەگاکانی لەژێر فشاری ئەمریکی لەدەست دا، بەڵام هەر زوو ئەو بنکە و بارەگایانەی لە ئەفغانستان لەماوەیەکی کەمدا دروستکردووە، ئەمەش وایکرد لە پێگەیەکی باشتردا بێت، بەتایبەتی دوای شەڕی ئەمریکا بۆسەر ئەفغانستان لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠١، لقە هەرێمایەتییەکانی قاعیدە لەزۆر لایەوە یارمەتی لۆجیستی مەشق و ڕاهێنان و

---

[1] بۆ نووسینی ئەم بابەتە سود لە (القاعدة من الداخل) وەرگیراوە.

ئەندامی سەرکردایەتی و سەربازگیریان پێشکەش بە قاعیدە کرد. ئەم خێرایی جموجۆڵەی ڕێکخستنەکانی قاعیدە لە ڕاوەدونانی (کۆمەڵی ئەبو سەیاف) لەلایەن هێزەکانی ئەمریکییەوە ساڵی ٢٠٠٢ بەڕوونی دەرکەوت. لقی هەرێمایەتی قاعیدە لە (مینداناو) بەخێرایی سەدان ئیسلامی فلیپینی مەشق پێکرد و ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەی کردن. لێرەدا پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێ کە هێزی بنچینەیی قاعیدە لەناو بزاوتە ئیسلامییەکان و ڕەوتە ئۆپۆزسیۆنەکاندایە. هەروەها کاتێ سەدان ئەندامی ئەو ڕێکخراوە دوای ڕووداوی ١١ی سێپتێمبەر لە ئەمریکا و ئەوروپا دەستگیر کران، قاعیدە بەچەند مانگێك توانی چەند شانەیەکی نوێ دابمەزرێنێ و پارێزگاری لە هەندێ شانەی کۆنیش بکات. ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە لەگەڵ ئەوەی سەرکردایەتی چالاکییەکانی قاعیدە لە ئەفغانستان تووشی ئیفلیجی هاتن، کەچی چالاکییە مەیدانییەکانی ئەو ڕێکخراوە لە زۆرێك لە وڵاتانی جیهان بەبێ ئاستەنگ دەچووە پێش.

ڕێکخراوی قاعیدە لە دوای ساڵی ١٩٩٨ پاڵپشتی لەو هەڕەشە و هێرشانە دەکرد کە دژبە فەرمانڕوا موسوڵمانەکان دەکرا و یارمەتی قوربانیانی ڕژێمە ناموسوڵمانەکانی وەك (فلیپین و کشمیر و بۆسنە و چیچان) دەکرد، هەروەها قاعیدە هاوپەیمانییەکی لەنێوان ئیسلامییە توندڕەوەکانی کۆمەڵی ئەبو سەیافی فلیپین و کۆمەڵی ئیسلامی میسر (الجماعة الاسلامية المصرية) و کۆمەڵە جەزائیرییە چەکدارەکان، دروستکرد.

هەروەها لە چیچانیش کادیرانی سەر بە قاعیدە کۆمەڵی موجاهیدانی ئەنسار (شوێنکەوتوانی مەهدی کە بەناوی ئەنسار)ەوە ناسرابوون، دروستکرد. ئەم کۆمەڵەش لە توندڕەوترین سێ کۆمەڵەکەی چیچانە و بەرپرسی هەموو چالاکییە خۆکوژیەکانی ئەوێیە.

کابرایەکی عێراقی بەناوی (ابا ایوب العراقی) یەکەم جێگری ئوسامە بوو. لە سەرەتای دامەزراندنی ڕێکخراوەکە بە ئەمیری ڕێکخراوەکە دانرا. ابا ایوب یەکەم کۆبوونەوەی سەربازگیری لە سەربازگەی (فاروق) لە خوست لە ئەفغانستان لە کۆتایی ساڵی ۱۹۸۹ گرێدا، کە ژمارەیەکی کەمی کۆنە جەنگاوەرانی جیهادی ئەفغانی بۆی بانگهێشت کرابوون. ابا ایوب بە هاوەڵی براکەی کە ناوی (یاسین) بوو لە کۆبوونەوەکە ئامادەبوون، لەوێدا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە پێویستە مەشق و ڕاهێنانی چەکداران هەتاکو دوای تەواوبوونی خەبات دژ بە سۆڤیەتیش بەردەوام بێت. ئەمەش بۆ ئەوەی لە ئازارەکانی موسوڵمانانی هەموو دونیا کەم بکرێتەوە. ئەوانەی لەم کۆبوونەوەیەدا ئامادەبوون لەبەردەم لیژنەی ناوەخۆی قاعیدە سوێندیان خوارد. لیژنەی ناوەخۆی قاعیدەش ئەوکات پێکدەهات لە (ئەیمەن زەواهیری- ناسراو بە دکتۆر عبدالعزیز) سەرۆکی بزووتنەوەی جیهادی میسری و دکتۆر فەزل المصری (کە برینپێچێکی میسری بوو) و جمال احمد الفضل (ناسراو بە ئەبوبکری سودانی کە خوێندکارێکی زانکۆی ئەمریکا بوو) و ابو فەرج یەمەنی و ابو موسعەب سعودی و عزالدین ابو برهان.

هەرچەندە (ئەیمەن زەواهیری) و (فضل المصري)، کە لە ئەنجوومەنی شورای قاعیدە بوون لە کۆبوونەوەکە لەپاڵ ئەمیری قاعیدە ئامادەبوون، کەچی گەورە سەرکردە سەربازییەکان سەرپەرشتی ئەو سوێند خواردنەیان کرد. دوای دوو ساڵ (ابو عبیدة البنشیری) شوێنی (ابا ایوب العراقی) گرتەوە، دوای مردنی (البنشیری) لە ساڵی ۱۹۹۶، (محمد عاطف) شوێنی ئەوی گرتەوە.

ئوسامە بن لادن لە ڕێگەی دەرکردنی بەیان و گوتار و فەرمانی نووسراو کۆنترۆڵی عەقائیدی و سەربازی کۆمەڵە و کادیران و پەیوەندییەکانی قاعیدە و پارتەکان، دەکات. ئوسامە هەوڵدەدات دەسەڵات بەسەر گروپەکانی سەر بە قاعیدە دابسەپێنێ و کار لە بیرکردنەوە و ڕەفتاریان بکات. ئەو گروپانەش

لەنێوان خۆیان بە شێوەی هاوپەیمانیەتییێکی نەرم کاردەکەن و هەریەکەیان خودان ستونی ڕێکخستن و سەرکردایەتی و پەیوەندی تایبەت بەخۆیانن. ئەم گروپە هاوپەیمانانەش (جماعات التحالف) خەسڵەتێکی تایبەتیان هەیە، ئەویش لەکاتی زەروریدا پەیوەندی بەیەکەوە دەکەن یان دەبن بە یەك پارت و یارمەتی دارایی و تەکنیکی پێشکەش بەیەکتری دەکەن، بۆ بەدیهێنانی مەبەستی دیاریکراو. ساڵی ١٩٩٨ ڕێکخستنەکانی خۆی لەسەر (٤) چوار دەزگای تایبەت ڕێکخست کە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە:

١- ڕێکخستنی پەیکەری هەرەمی، کە ئەرکی ئاراستەکردنی ستراتیژی و تەکنیکی ئاسان دەکات.

٢- تۆڕی تیرۆرستی جیهانی.

٣- هێزێکی سیاسی بۆ بەرپاکردنی شەڕی پارتیزانی.

٤- هاوپەیمانێتی نەرم، کە لە نێوان گروپە تیرۆرستییەکاندا هەیە، ئەوانەی بە ئاسانی دەتوانن سنووری نێودەوڵەتی ببڕن.

ئەنجوومەنی شورای ڕێکخستنی قاعیدە لە ئەمیرێك و چەند ئەندامێك پێکدێت کە ئاستێکی بەرزی شارەزاییان هەیە. ئەوانەی سەرەتا لەم ئەنجوومەنی شورایەدا بەشداریان کرد بریتی بوون لە (ایمن الزواهیری، ابا ایوب عیراقی، البنشیری، ابو حفص المصری، ابو ابراهیم العراقی، دکتور فضل المصری، ابو فرج الیمني، ابو فضل المکی، خلیفة العمانی، سیف اللیبی و ابو برهان العراقی، ابو محمد المصری و سعد الشریف)، ناوەناوە شوێنگۆڕی ئەندامانی ئەو شورایە لەپێناو زامنکردنی شەرعیەت و ملکەچ نواندن، ئەنجام دەدرا. ئوسامە کەسایەتی دیار و لایەنگری بەوەفای لە پایە ئیداری و سیاسییەکانی قاعیدە دادەمەزراند. هەرچەندە قاعیدە پارتێکی سیاسی ئایدیۆلۆژی ئایینییە، بۆیە سیستەمی فەرمی بۆ سەربازگیری یان دامەزراندن یان پلەبەخشینی تێدا نەبوو، بەڵکو بۆ ئەم مەبەستە پشتی بە

خەسڵەتی شەخسی و توانا و لێهاتوویی و ئاستی لێوەشاوەیی کەسەکان دەبەست. دوای ئەنجوومەنی شوراش چوار لیژنەی کاروچالاکی کە ڕاپۆرتەکان پێشکەش بە ئەنجوومەنی شورا دەکەن، دێن، ئەوانیش:

١- لیژنەی سەربازی دارایی.

٢- لیژنەی ئابووری.

٣- لیژنەی دیراساتی پروپاگەندە.

٤- لیژنەی ڕاگەیاندن.

ئەم لیژنانە چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کاری ڕۆژانەی قاعیدە لە ئەستۆدەگرن و ئەمیرێك سەرۆکی هەریەك لەم لیژنەیەیە، لەکاتێکدا ئەمیر و جێگرەکەی بەرپرسی ئەم لێژنانەن. ئەندامانی ئەم لیژنانەش بە شێوەی کۆمەڵەی کاری سەربەخۆ کارەکانیان ئەنجام دەدەن. هەندێکجار لەنێوان ئەم لێژنانە ئەندامان هەڵدەبژێردرێن بۆ ڕاپەڕاندنی کاری تایبەت بە ئوسامە، بەتایبەت لەنێو لیژنەی سەربازی یان بۆ هەندێ سەرکردەی دیکەی قاعیدە.

هەرچی لیژنەی سەربازی قاعیدەیە بەرپرسە لە سەربازگیری، مەشق، کڕینی چەك، گواستنەوە، هێرشی سەربازی، دانانی تەکتیکی سەربازی و هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی پیشەسازی چەك.

هەروەها ڕێکخستنی قاعیدە شانەی عەمەلیات (خلایا العملیات)ی هەیە، کە لەژێر دەستی (البنشیری) دایە و هێزی تایبەتی کۆمۆندۆز لەخۆ دەگرێت، کە دواتر (محمد عاطف) لەم پۆستەدا شوێنی (البنشیری) گرتەوە.

محمد موسی سەرپەرشتی دەزگایەکی دیکەی قاعیدەی دەکرد، ئەویش (دەزگای ئاسایشی ناوەخۆ) بوو، کە ئەرکی ئامادەکردن و مەشق پێکردنی سەرکردەی پاسەوان و پاراستنی ڕێکخراوەکە لەدژی هەر مەترسەیەکی دەرەکی یان هەر دزەکردنێك بۆ ناو ڕیزەکانی قاعیدەی لەئەستۆ دابوو.

لیوای (٥٥) یەکێکە لە دەزگا هەرە سەربازیەکانی قاعیدە کە لە تێکەڵاوکردنی (دەزگای شەڕی پارتیزانی و چالاکی خۆکوژی) دروست بووە. ئەم لیوایە بووە بە بەشێك لە سوپای ئیمارەتی ئیسلامی ئەفغانی، ئەم لیوایە دواین دەزگای قاعیدە بوو کە دروستکرا. ئەم لیوایە لە شەڕکەرانی بەتوانا و شارەزا، کە لە دوو هەزار چەکدار لە نائەفغانەکان پێکهات کە زۆربەیان عەرەب و بەشێکیان لە ئاسیای ناوەڕاست و هەندێکشیان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و کەمێکیش لە چین و چەندینی دیکەش لە ئەوروپا و ئەمریکاوە هاتبوون.

ئەندامانی ئەم لیوایە لە دوو نەوە، نەوەی یەکەم لەو شەڕکەرانەی سەردەمی شەڕی ئەفغان و نەوەی دووەم لەوانەی دوای کۆتایی هاتنی شەڕ هاتبوونە ئەفغانستان پێکهاتبوو. هەروەها مەشقێکی چاکیان پێکرا بوو. هەردوو نەوەکە ملکەچی تەواویان بۆ ئوسامە بن لادن دەنواند و بە سەرۆکی رۆحی خۆیانیان دەزانی. ئەم لیوایە بە تازەترین چەکی سەردەم پڕچەك کرابوو. قاعیدە تۆڕێکی جیهانی بۆ کڕینی چەك و تەقەمەنی و کەلوپەلی سەربازی بە سەرپەرشتی هاوولاتی ئەمریکی (عصام الریدی – کە فرۆکەوانی تایبەتی ئوسامە بوو) پێکهێنابوو. ئەم پیاوە کەلوپەلی پەیوەندیکردنی لە ژاپۆن، دەزگای چاودێری و نیشانەگرتنی لە بەریتانیا، تەلەفۆنی سەتەلایت لە ئەڵمانیا، ئامێری بینینی شەو، کەلوپەلی ڤیدیۆیی و فرۆکەی لە جۆری ٣٨٩ لە ڕێگەی شانەکانی لەو وڵاتانە، بۆ قاعیدە بەدەست هێنابوون.

# هێڵکاری پەیکەری ڕێکخستن لەناو قاعیدە

## سەرچاوە داراییەکانی قاعیدە

هەروەك لە پەیکەری ڕێکخستندا هاتووە، لەناو قاعیدە لیژنەی دارایی و ئابووری هەیە. ئەو لیژنەیە سەرپەرشتی ئیدارەی مەسەلەی دارایی بۆ مانەوەی قاعیدە، دەستەبەر دەکات. لەبەرئەوەی ڕێکخراوی قاعیدە لە هەموو ئەو شوێنانەی کە موسوڵمانی لێن، سوودیان لێ وەردەگرێت بۆ دابینکردنی لایەنی دارایی. زۆرترین ئەو شوێنانەی کە قاعیدە زۆرترین یارمەتی دارایی لێوەردەگرێت، ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ناوچەی کەنداوی عەرەب و دورگەی عەرەبە کە یارمەتی دارایی لە هەندێ دامەزراوەی ئیسلامیش وەردەگرن. بەگوێرەی ڕاپۆرتەکانی هەواڵگری بەتایبەت (C.I.A) دەرکەوتووە، کە هیچ ڕێکخراوێك وەك قاعیدە لە جیهان نییە کە سیستەمی کارکردنی ئاڵۆز بێت، چونکە قاعیدە سەرکەوتوو بووە لە کۆکردنەوە و گواستنەوە و بردنی پارە لە شوێنێ بۆ شوێنێکی دیکە، کە تا ئێستا وردەکارییەکانی ئەو کۆکردنەوە و گواستنەوەیەی پارە بەدەرنەکەوتووە.

لیژنەی دارایی قاعیدە چەندین ژمێریار و پارەگۆڕەوە و شارەزایانی دارایی لێهاتووی لەخۆ گرتووە کە سەرپەرشتی تۆڕی دارایی قاعیدە لە هەموو جیهان دەکەن. بۆ گواستنەوەی پارە بەنهێنی لە سەرچاوەیەکەوە بۆ سەرچاوەیەکی دیکە، تۆڕی دارایی قاعیدە بۆ ئەم مەبەستە ناو، یان ناسنامەی ڕاستەقینەی خەڵك (ئەندامانی) بەکارناهێنێ.

بۆ ئەوەی پارەی قاعیدە لە شوێنێك بەنهێنی بۆ شوێنێکی دیکە بگوازرێتەوە، قاعیدە چەند دامەزراوێکی یاسایی لە چەشنی (کۆمەڵە خێرخوازییەکان و بەنك و کۆمپانیا)ی دروست کردووە. ڕێکخراوی قاعیدە بۆ پاراستنی هێز و دەسەلات

و بەخێوکردنی (٣) هەزار ئەندام لە ئەفغانستان و سیخوڕەکانی لە هەموو جیهان، ساڵانە (٣٦) ملیۆن دۆلاری خەرج کردووە. هەروەها خەرجی ڕێکخستنەکان، چەك، دامەزراندنی سەربازگە، دروستکردنی نووسینگە، کڕینی خانوو و ئۆتۆمبێل دەگاتە نزیکەی (٥٠) ملیۆن دۆلار.

ئەو پارانەی قاعیدە دەیدا بە کۆمەڵ و پارتە ئیسلامییەکان بۆ ئەوەی لایەنگری لێبکەن ئەوەندە کاریگەری هەبوو لەسەر بەهێزکردنی نفوزی قاعیدە لەناو ئەو پارت و ڕێکخراوە ئیسلامییانەدا، بەڕاددەیەك زۆربەی زۆری سەرکردە سیاسییەکان و ئایینییەکان و هەتاکو سەربازییەکانیش لەو کاریگەریە دەرنەچوون. نموونەی ئەمەش لە بزووتنەوەی تالیبان و وەزارەتی بەرگرییەکەی بەئاشکرا دیاربوو. ئەمەش وایکرد قاعیدە بەئازادانە لەناو ئەفغانستان کاری سیاسی و چالاکی سەربازی خۆی پەرەپێبدات.

هەرچەندە دوای شەڕی دژە تیرۆر سەرچاوە داراییەکانی ڕێکخراوە تیرۆرستییەکان کەم بۆتەوە، بەڵام قاعیدە ئەو پارانەی لە گەلێك سەرچاوەوە، بەدەست دەگات. ئێستا عەرەبە دەوڵەمەندەکان و کەسایەتییە دیارەکانیان لە سەرچاوە سەرەکییەکانی دارایی قاعیدەن، بۆ ئاسانکاری ئەو دەست ئەو دەستکردنی پارە، قاعیدە بەنکەکان وەك رووکارێك بۆ کارەکانی خۆی بەکاردێنیێ.

دەزگای هەواڵگری ئەمریکی لە چاودێریکردنی دارایی پارەی قاعیدە، گەیشتۆتە ئەنجامی سەیر، بۆ نموونە پارەی هەوڵی تیرۆرکردنی سەرۆکی میسر(حسنی موبارەك) لە ڕێگەی بانکی بازرگانی نیشتیمانییەوە گواستراوەتەوە، ئەو بەنکەش چەندین ملیۆن دۆلاری بۆ بانکی دیکە کە حسابی قاعیدەی تێدا بووە لە بانکەکانی ئەمریکا و بریتانیا تەحویل کردووە، بەبێ ئەوەی ئەو بانکە ئاگاداری ئەوەبن کە ئەو مامەڵەیەی کراوە بۆچی بووە.

هەروەها قاعیدە دەستە و دامەزراوە خێرخوازییەکانیشی بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێناوە. لە ناوەڕاستی نەوەدەکانەوە، دەزگای هەواڵگری ئەمریکی ناوی

(٥٠) دەستە و کۆمەڵەی خێرخوازی دیاریکرد کە یارمەتی کاری تیرۆرستی دەدەن یان کارمەندەکانی ناو ئەو کۆمەڵە خێرخوازیانە لەوانەن کە گومانیان لێ دەکرێ یارمەتیدەری تیرۆر بن. ئوسامە بن لادن لە هەریەکە لە ئەفغانستان و سودان پێویستی بەوە نەبوو، ناوی لەناو کارە بازرگانییەکان بشارێتەوە بۆ نموونە لە سودان ئوسامە ٥٠ ملیۆن دۆلاری لە بانکێك کە دەوڵەمەندانی (الجبهة الاسلامية) هاوبەشی بوون، وەبەرهێنا. ڕێکخراوی قاعیدە بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی سوودی لەو کەسانەش وەردەگرت کە توانای قەلبکردنی پارە و دیکیۆمێنتی فەرمیان هەبوو، قاعیدە بۆ زامنکردنی پارەکانی پەیڕەوی لەم پرەنسیپانە دەکرد:

١- دابەشکردنی پارەکان لەنێوان وەبەرهێنەران، ئەمەش بۆ زامنکردنی خێروبێری ئەو وەبەرهێنانە و بەکارهێنانی بە شێوەیەکی کارا.
٢- نابێت هەموو پارەکانی کار و چالاکی لەیەك شوێنی دیاریکراو دابنرێت.
٣- نابێت ژمارەیەکی زۆر، زانیارییان لەسەر شوێنی هەڵگرتنی پارە و پولی قاعیدە هەبێ، جگە لە چەند کەسانێك نەبێ.
٤- پێویستە ئەو ئەندامەی پارێزگاری لە پارەی قاعیدە دەکات، هەموو ڕێ و شوێنێکی زەروری بۆ پاراستنی ئەو پارەیە بگرێتەبەر.
٥- نابێت پارە بەخۆڕایی خەرج بکرێت، تەنها لە حاڵەتی پێویست نەبێ.

**قاعیدە دوو جۆر لە حیسابات کار پێدەکات:**

أ- الحسابات المغذية: ئەو جۆرە حسابەیە کە لە بەنکەکان بەناوی کۆمەڵە و کۆمپانیای خێرخوازی دەکرێتەوە.

ب- الحسابات التشغيلية: ئەو جۆرە حسابەیە کە بەناوی ئەو کەسانە لە بەنکەکان دەکرێتەوە کە ئەندامن، بەڵام ناسنامەیان ناسراو نییە، یان لایەنگری باوەڕپێکراون.

قاعیده پشت بەو (حەوالانە) دەبەستیٚ کە بیٚ ناون (الحوالات المصرفیة غیر الاسمیة)، چونکە بەهۆی ئەو حەوالانەوە دەکریٚت پارە بەبیٚ چاودیٚری یان سانسۆری ژمیٚریاری یان حکومی بگوازریٚتەوە.

سەرچاوە داراییەکانی قاعیدە هەر لە ریٚگەی کۆمەڵە و ریٚکخراوە ئیسلامییە خیٚرخوازەکان و خیٚروبیٚری دەرەکی دەست ناکەویٚت، بەڵکو قاعیدە تۆریٚکی جیهانی بۆ وەبەرهیٚنان دروست کردووە، بۆ نموونە قاعیدە لە مۆمباسا بەلەم و کۆمپانیای ڕاوی ماسی دامەزراند بوو، لە سویدیش کۆمپانیای پیشەسازی دروستکردنی کەلوپەلی پزیشکی دامەزراند بوو، لە دانیمارك بە بەرهەمەکانی شیرەمەنی خەریك بووە، لە نەرویج بە پیشەسازی کاغەز، هەروەها قاعیدە نووسینگەی (پەناهەندە و بەڵگەنامە)ی لە پاکستان کردبووەوە، کە فیزا و بلیتی فڕۆکەی دەفرۆشت، هەریەکە لە (حمزة اللیبی و ابو یاسر الجزائری و ابو عبدالصبور) لەم نووسینگەیەدا کاریان کردووە.

## پەیوەندی قاعیدە بە بزووتنەوەی تالیبانەوە

هەروەك لە بەشەکانی پیٚشوی ئەم تویٚژینەوەدا باسمانکرد، کاتیٚ لاوە عەرەبەکان، بە مەبەستی شەڕکردن دژ بەهیٚزەکانی سۆڤیەت ڕوویان لە ئەفغانستان دەکرد، دوای ئەوەی لە سەربازگەکانی ئوسامە و عەزام مەشق و ڕاهیٚنانیان تەواوکرد، تەسلیم بە گروپە ئەفغانییە شەڕکەرەکان دەکران و ڕەوانەی بەرەکانی جەنگ دەکران. بەڵام ئەم ڕەوشە لە سەرەتاکانی شەڕی ئەفغان ۱۹۷۹ تا کۆتایی شەڕ ساڵی ۱۸۷۹ی خایاند، ئیدی شەڕ کۆتایی هات و ئەو هۆکارانەی ئەو لاوە عەرەبانە بۆی هاتبوون، لەئارادا نەمان، ئەوەبوو بەشیٚکیان بۆ وڵاتەکانیان گەڕانەوە و شەڕیان لە دژی ڕژیٚمە سیاسییەکان بەرپاکرد، بەشیٚکی دیکەیان بە دوای زەمینەیەکی تازەی جیهاد گەڕان لە (کشمیر، فلیپین، بۆسنە،

چیچان). بەشێکی دیکەیان دوای بەرپابوونی شەڕی نێوەخۆی ئەفغان لەم شەڕە بەشداریان کرد. ئەفغانە عەرەبەکان سەرەتا دایانە پاڵ (قلب الدين حكمتيار)ی سەرۆکی پارتی ئیسلامی، ئەمەش لەپای ئەو چاکەیەی کە حکمتیار لەگەڵ ئەو عەرەبە ئەفغانانەی سنووری پاکستان کردبووی، کاتێ لە لایەن هێزەکانی پاکستانەوە فشاریان بۆ هات، حکمتیاریش داوای لێکردن لە پیشاوەرەوە بێنە ناو ئەفغانستان[1]. بەڵام کاتێ بزووتنەوەی تالیبان سەریهەڵدا ڕەوشەکە تەواو پێچەوانە بووەوە. لێرەدا پێویست دەکات، بزانین بزووتنەوەی تالیبان چیە؟ ئامانجەکانی چین؟ هۆکارەکانی سەرهەڵدانی چین و چۆن توانی لە ماوەیەکی ئاوا کەمدا دەسەڵات بەسەر ئەفغانستان دا بکێشێ؟

بزووتنەوەی تالیبان (بزووتنەوەی ئیسلامی قوتابیان و قوتابخانە ئایینییەکان)[2] لە ساڵی ١٩٩٤ لە ویلایەتی قەندەهار سەر سنووری ڕۆژئاوای پاکستان – ئەفغانستان لەسەر دەستی (مەلا موحەمەد عمر) دامەزرا. مەلا محمد عمر سەرەتا ویستی ئەو فەزای فەساد و بێ ئەخلاقی و نائارامیەی ئەفغانستان، کە لە ئەنجامی شەڕی نێوخۆ سەریهەڵدا بوو، لەناو ببات. بۆیە قوتابیانی قوتابخانە ئایینییەکان لە ساڵی ١٩٩٤ وەك ئەمیری کۆمەڵەکە موبایەعەیان پێ کرد. زۆرینەی ئەندامانی بزووتنەوەی تالیبان سەربە نەتەوەی (پەشتۆن)ن کە زۆربەیان لە ڕۆژهەڵات و باشووری ئەفغانستان نیشتەجێن و نزیکەی ٢٨٪ی ڕێژەی دانیشتوانی ئەفغانستان لە کۆی ٢٧ملیۆن کەس، پێکدێنن. تالیبان بزووتنەوەیەکی سوننە مەزهەبە، لەو باوەڕەدایە کە حوکمی شەرعی بابەتێکە قابیلی موناقەشەکردن نییە، بۆیە کاریان بۆ جێبەجێکردنی ئەم حوکمە دەکرد. ئەندامانی ئەم بزووتنەوەیە لە قوتابخانە ئایینییەکانی دیوبندی (گوندێکی هیندیە) و لەژێر کاریگەری قوتابخانە ئایینییەکانی ئەوێ دابوون، ئەمەش لە

---

[1] الافغان العرب محاولة للتعريف... د. نشأة حامد عبدالماجد – اسلام اون لاين.

[2] حركة الطالبان، المصدر الجزيرة نت.

شێوازی حوکمڕانیان ڕەنگی دابووەوە. ئەمانە زۆر جەختیان لەسەر زانستە ئایینییەکانی وەك تەفسیر و حەدیس و هەندێ زانستی هاوچەرخی کلاسیکی دەکردەوە.

## هۆکارەکانی دروست بوونی بزووتنەوەی تالیبان

### أ-هۆکارە نێوخۆییەکان

١- **شەڕی نێوخۆیی:** دوای کۆتایی هاتنی شەڕی دژ بە سۆڤیەت گروپە ئەفغانییەکان لەسەر دەسەڵات کەوتنە ململانێ و شەڕەوە بۆ حوکمکردنی وڵات. هەر لایەنە خۆی بەڕاست دەزانی. ئەم شەڕانەش زیانێکی زۆری گیانی کە گەیشتە نزیکەی ٤٠ هەزار کوژراو و زیانی ماددیش کە مەزەندە ناکرێت بەگەلی ئەفغانی گەیاند. هەروەها بەبنبەست گەیشتنی هەموو هەوڵەکانی میانگیری، ئەمەش وای لە ئەفغانەکان کرد، بزووتنەوەی تالیبان وەك تاکە ڕزگارکەری ئەم ڕەوشە خراپە ببینن و لە نەهامەتیەکانی شەڕو بێ ئاسایشی قوتاریان بکات.

٢- **پەشێوی و نەبوونی ئاسایش:** پەشێوی و سەرگەردانی دوای کشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت ڕووی لەگەلانی ئەفغانی کرد و ئەفغانستان لە نێوان لایەنە ناکۆکەکان دابەشبوو. یەکێتیی خاکی ئەفغانستان کەوتە ژێر هەڕەشەوە، دانیشتوان هیچ هێزێکیان شك نەدەبرد کە ڕێز لە یاسا بگرێت و بڕیارەکان جێبەجێ بکات، کاتێ بزووتنەوەی تالیبان دەرکەوت، حکوومەتەکەی ڕەبانی و شاه مەسعود دەسەڵاتی بەسەر حەوت ولایەت لە باکوور و ناوەڕاست دەڕۆیشت، هەرچی سەرکردەی شیوعی (عبدالرشید دۆستەم) بوو دەسەڵاتی بەسەر شەش ولایەتی باکووردا دەڕۆیشت، شورای نەنگەهار دەسەڵاتی بەسەر سێ ولایەتی ڕۆژهەڵاتدا دەڕۆیشت، ئیسماعیل خانیش لە ڕۆژئاوای ئەفغانستان دەسەڵاتدار

بوو، چەند ولایەتی دیکەش بەبێ دەسەڵات بوون، بزووتنەوەی تالیبانیش لەم کاتەدا تاکە هیوای گەلانی ئەفغاستان بوو، بۆ ئەوەی یەکێتیی وڵات بپارێزێ و مەترسی پارچەپارچە بوون دووربخاتەوە.

**٣- فەسادی ئەخلاقی:** لە هەموو لایەکی وڵات فەسادی ئیداری و ئەخلاقی تەشەنەی کردبوو، کەسیش لێپرسینەوەی لەگەڵدا نەدەکرا، لێرەدا چیرۆکی ڕزگارکردنی ئەو کچە ئەفغانییە لەلایەن خودی (مەلا محمد) باشترین نموونەی ئەو بەدڕەوشتیەی ئەوکات بووە، ئەویش ئەوەبوو، لە یەکێ لە بازگەکانی چەکدارانی ئەفغانی دەستدرێژی ناموس کرابووە سەر کچێك و هەواڵی ئەم ڕووداوە بە مەلا محمد عمر دەگات ئەویش بەخۆی و چەند چەکدارێکەوە، بۆ شوێنی بازگەکە دەچێ و کچەکە ڕزگار دەکات و تاوانباران لەوێ سزا دەدات، ئەمەش ناوبانگێکی زۆر بۆ مەلا محمد پەیدا دەکات.

**٤- نا ئارامی:** گەلانی ئەفغانی بەدەست نەبوونی ئاسایشەوە دەیان ناڵاند، دزینی ئۆتۆمبیل بەتایبەت ئۆتۆمبێلی دەزگا خێرخوازەکان و دزینی هاووڵاتیان و پێکدادانی چەکداری لە شوێنە قەرەباڵغەکان کە زۆربەی جاران هاووڵاتیانی بێ گوناە دەبوونە قوربانی، دانانی باج و سەرانەی زۆر لەسەر هاووڵاتیان. بۆیە هاووڵاتیان لە دوای هێزێك دەگەڕان کە ئاسایش و مافی زەوتکراویان بۆ بگێڕێتەوە، ئەمەش ڕێگەی بۆ بزووتنەوەی تالیبان خۆشکرد کە بێتە گۆڕەپانەکەوە.

دەرکەوتنی چینێکی دەوڵەمەندی مشەخۆر لە سەر حسابی زۆرینەی هەژاران لە ئەنجامی دزینی کەلوپەلی بەبەهای ئەفغانستان و بازرگانیکردنی نایاسایی و ناشەرعی و بەتاڵانبردنی سەروەت و سامانی وڵات، ئەمەش زیاتر ڕەوشەکەی ئاڵۆزتر کردبوو، ئەو بانگەشە ئیسلامیانەی تالیبان سەدایەکی زۆری لە نێوان هاووڵاتیان پەیداکرد بوو.

### ب- هۆكاره دەرەكییەكان

**١- ڕۆڵی پاكستان:** پاكستان هەوڵی دەدا حكوومەتێكی دۆست لە ئەفغانستان دابمەزرێ، چونكە حكوومەتەكەی ڕەبانی و مسعود بە پەیوەندیكردن بە هیندستانەوە لەلای پاكستانەوە تۆمەتبار دەكرا. بۆیە هەوڵی لەناوبردنی دەدات، بۆ ئەمەش یارمەتی حكمەتیار و دۆستەمی دا، بەڵام لەم هەوڵەی سەرنەكەوت، بۆیە كاتێ بزووتنەوەی تالیبان بەدەركەوت زوو پاڵپشتی لێكرد.

**٢- ڕۆڵی ئەمریكا:** لە سەرەتاكانی دەركەوتنی بزووتنەوەی تالیبان ئەمریكییەكان ویستیان پاڵپشتی بكەن، ئەمەش بۆ ئەوەی گۆڕەپانی ئەفغانی تەنها یەك دەسەڵاتی توندڕۆی ئیسلامی تێدا دەسەڵاتدار بێ بۆ ئەوەی بتوانێ بەئاسانی بیخاتە بازنەی بەرژەوەندییەكانی خۆی، هەروەها ئەمریكییەكان بەمەش دەیانتوانی لە نفووزی دەسەڵاتی ئێرانییەكان لەناو خاكی ئەفغانستان كەم بكەنەوە، بۆیە ئەگەرچی یارمەتی ماددی و مەعنەوی پێشكەش بە بزووتنەوەكە نەكرد، بەڵام ڕێگریشی بۆ دروست نەكرد.

## ئامانجەكانی بزووتنەوەی تالیبان

بزووتنەوەی تالیبان كاتێ لە ١٩٩٤/١١/٣ دەستیان بەسەر بەڕێوبەرێتی (سین بۆلدك) دا گرت، لەسەر زاری قسەكەری فەرمی (مەلا عبدالمناف نیازی) ڕایگەیاند كە ئامانجی بزووتنەوەكەیان گێڕانەوەی ئارامی و ئاسایش و كۆكردنەوەی چەكی لایەنە ئەفغانییەكان و هەڵگرتنی بازگەی ڕێگا گشتییەكانە. كە پارە لە خەڵك دەسەنن. بەڵام دوای ئەوەی بزووتنەوەی تالیبان دەستی بەسەر چەند ویلایەتێكدا گرت، ئامانجەكانی خۆی فراوانكرد و كردیە (دامەزراندنی حكوومەتی ئیسلامی)، دواتر تالیبان بەم شێوەیە ئامانجەكانی خۆی خستەڕوو:

١- دامەزراندنی حکوومەتێکی ئیسلامی لە شێوەی (خەلافەت)و، ئایینی ئیسلام ئایینی گەل و حکوومەتەکە بێت و یاسای دەوڵەتیش لە شەریعەتی ئیسلامەوە بێت و زانایانی ئیسلامی پایە ئیداری و حکومییەکان وەربگرن.

٢- ڕیشەکێشکردنی نەتەوەپەرستی و تیرەگەری.

٣- پارێزگاریکردن لەوانەی نا ئیسلامن و، سەرو ماڵ و موڵکیان بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام دەپارێزرێت.

٤- بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵ حکوومەت و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان.

٥- پەچەپۆشین لە کۆمەڵگا و دامودەزگاکان فەرز دەکرێت.

٦- قەدەغەکردنی تاوانی ئەخلاقی و لەناوبردنی ماددەی بێهۆشکەر و فیلمی ڕووت.

٧- دامەزراندنی دەستەی (کارکردن بەچاکە و نەهی لە خراپە).

٨- پێویستە مەحکەمە شەرعییەکان دەسەڵاتی بەسەر هەموو دەزگاکانی دەوڵەتدا بڕوات.

٩- پڕۆگرامی ئیسلامی لە قوتابخانەکان و زانکۆکان پەیڕەو دەکرێت.

١٠-هەموو کێشەکان بەکیتاب و سوننە جێبەجێ دەکرێن.

لە ماوەی حوکمڕانی دەسەڵاتی تالیبان تەنها (٣) حکوومەت دانی بە دەوڵەتەکەی تالیبان نا ئەوانیش (پاکستان و سعودیە و ئیمارات) بوون.

ئوسامە بن لادن دوای ئەوەی زۆر بەنهێنی لە سودانەوە لە ژێر فشاری ئەمریکی بۆ ئەفغانستان دەگەڕێتەوە، لە ئەفغانستان لە لایەن دوو شێخی ئەفغانییەوە (شێخ یونس خالص و شێخ حەقانی) بەخۆی و ئەو عەرەبە ئەفغانانەی کە یاوەری بوون پێشوازی دەکرێت. هەر دوای گەیشتنی بۆ ئەفغانستان بە پەلە نامەیەك بۆ لایەنە ئەفغانییە ناکۆکەکان دەنێرێت و پێیان ڕادەگەیەنێت کەوا ئەو هەر لەسەر بەڵێنی خۆیەتی و توخنی شەڕی نێوان لایەنە ناکۆکەکان ناکەوێت، ئەم نامەیەش پێش ئەوەبوو کە تالیبان دەست بەسەر

(جەلال ئاباد و کابوڵ) بگرێت. دوای تەقینەوەکەی شاری (خبر)ی سعودی، شانشینی سعودی هەوڵیدا فشار بخاتە سەر ئەم دوو شێخەی کە میوانداری ئوسامەیان کردبوو، بۆ ئەوەی تەسلیم بە سعودیەی بکەنەوە. دوای ماوەیەکی کەم هێزەکانی تالیبان ئەو شوێنەیان دەست بەسەرا گرت کە ئوسامەی تێدابوو. پێشتر ئوسامە شتێکی کەمی لە بارەیانەوە زانی بوو، چونکە هەردوو شێخەکە لایەنگری خۆیان بۆ تالیبان نواند بوو، ئەم چاوەڕوانییەی ئوسامە زۆری نەخایاند، ئەوەبوو مەلا عومەر شاندێکی بۆلای ئوسامە ناردو دڵنیای کردەوە کە میوانێکی ئازیزی ئەوە و بەڵێنی دایە پارێزگاری لێبکات، بەڵام مەلا عومەر تکای لە ئوسامە کرد چالاکی ڕاگەیاندن ڕابگرێت، چونکە پێش ماوەیەك لەگەڵ کەناڵی CNN و کەناڵی چواری بەریتانی چاوپێکەوتنی سازکردبوو.

دواتر ئوسامە لەبەر مەسەلەی ئەمنی دەچێ لە قەندەهار دادەنیشێ، هەر لەو سەروبەندەدا، بزووتنەوەی تالیبان دەسەڵات بەسەر کابوڵی پایتەختدا دەگرێت، بەمەش تالیبان دەبێتە تاکە هێزی ئەفغانستان. لە قەندەهار ئوسامە هەوڵیدا چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ سەرۆکی تالیبان (مەلا محمد عمر) هەبێ، چونکە تا پێش ئەوکاتە ئەم دووانە یەکتریان نەبینی بوو، ئەگەرچی پێش ئەوکاتە نامە گۆڕینەوەی زۆریان لەنێواندا هەبووە. لەم دیدارەدا ئوسامە سوپاسی ئەمیری تالیبانی سەبارەت بەو میوانداری و پارێزگاریە کرد و لە بەرانبەریشدا ئەمیر خۆشحاڵی خۆی بەمیوانداریەکە و خەباتەکەی ئوسامە لە سەردەمی شەڕی ئەفغان دەربڕی، دووبارە مەلا عمر بە شێوەی تکا، داوای لە ئوسامە کرد هەڵمەتە ڕاگەیاندنەکانی کەم بکاتەوە. ئوسامەش وەڵامی دایەوە کە ئەو نەوەك هەرکەمی دەکاتەوە، بەڵکو بڕیاریداوە هەر نەیهێڵێ، تا ئەوکاتەی مەلا عومەر خۆی پێی دەڵێ دەست بەجموجۆڵ بکات، بەمەش ئەمیری تالیبان لە ئوسامە بن لادن ڕازی بوو[1].

---

[1] اسامة بن لادن، حياة، نشأته، سياسة، علاقات. المصدر: www.yafea.8m.com.

## بۆچوونی ئەفغانە عەرەبەکان (قاعیدە) دەربارەی تالیبان[1]

١- ئەفغانە عەرەبەکان پێیانوایە تالیبان ڕێکخراوێکی ئیسلامی، خاوەن عەقیدەیەکی خاوێنە پەیڕەوی لە نەهجی سەلەفی سالح دەکات.

٢- ئەفغانە عەرەبەکان پێیانوایە بزووتنەوەی تالیبان شەریعەتی ئیسلامی جێبەجێ دەکات.

٣- لە بەرئەوەی بزووتنەوەی تالیبان و دەوڵەتەکەیان (الامارة الافغانستان الاسلامیة) شەڕی بەرەی کوفر دەکات، بۆیە پێویستە شەڕیان لەپاڵ بکرێت لە دژی ئەوانەی نایانەوێت حوکمی شەرعی لەسەر زەوی بەرپا بێت.

٤- بزووتنەوەی تالیبان یارمەتی کەسایەتی و گروپە ئیسلامییە جیهادییەکان دەدات و بۆتە پەناگەی کەسایەتییە ئیسلامییە یاساغەکانی دونیا.

---

[1] افغانستان والطالبان ومعركة الاسلام اليوم، عمر عبدالكريم، www.ansar.org.

# بەشی شەشەم

# چالاکی ئەفغانە عەرەبەکان (قاعیدە) لە وڵاتان

لەم بەشەدا سەرەتا پەیدابوونی ئەم دیاردەیە لە هەریەکە لەو وڵاتانەی کە بەشی شێریان لە دروستکردن و هاندانی ئەفغانە عەرەبەکان هەیە، باس دەکەین. ڕیزبەندی ئەو وڵاتانە مەرج نییە بۆ پلەی چەندایەتی دیاردەکە، چونکە هەریەکە لەو وڵاتانەی لێرەدا باسکراون لە سەردەمێك لە سەردەمەکان، گەشە و نەشونومای تایبەت بەخۆیان کردووە، کەچی دەبینین سەردەمێکی دیکەی بەدوادا دێت دیاردەکە ڕوو لە پوکانەوە دەکات. مەرج نییە تەنها ئەو وڵاتانەی لەم توێژینەوەیەدا ناویان هاتووە، دیاردەی ئەفغانی عەرەبی (قاعیدە)یان تێدابێ، ئەوانی دیکەی کە ناویان نەهێنراوە، ئەم دیاردەیان نەبێ، ئێمە ئەو وڵاتانەمان بۆیە هەڵبژاردووە، چونکە بەوێستگەی یەکەمی دروستبوونی دیاردەکە دادەنرێت، بەڵام وڵاتانێکی دیکەی وەك (ئوردون، کوێت، لوبنان، فەلەستین، هەندێ وڵاتی کەنداو) کێشە و گرفتیان ئەوەندە زۆر نەبووە، بەدەست دیاردەکەوە، بۆیە باسم نەکردوون، هەرچەندە ئەو ساڵەی دوایی، خەریکە ئەو شەڕەی لە ئەفغانستان هەڵگیرسا بگاتە بەردەم دەرگای هەموو وڵاتێکی عەرەبی و ئیسلامی و ئەورووپیش.

## ئەفغانە عەرەبەکان و توندوتیژی سیاسی لە میسر:

وڵاتی میسر بەشی شێری لەناو دیاردەی ئەفغانی عەرەب و ڕێکخراوی قاعیدەی جیهاد بەرکەوتووە، ئەمەش لە بەرئەوەی بەشی زۆری ئەفغانە عەرەبەکان میسری بوون، کە بەپێی هەندێ سەرچاوە لە سەرەتای پەیدابوونی ئەم

دیاردەیە ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی هەزار کەس[1]، هەروەها لەبەرئەوەی زۆرینەی سەرکردەکانی قاعیدە و ئەفغانە عەرەبەکان لە میسرییەکان بوون کە دیارترینیان ئەیمەن زەواهیری) بووە. بۆ ئەوەی زیاتر لە ناوەرۆکی ئەو ڕۆڵەی ڕەوتە ئیسلامییە میسرییەکان لەناو دیاردەی ئەفغانی عەرەب گێڕاویانەبکەین، پێوستە سەرەقەڵەمێك لەسەر مێژووی دوو پارتی ئیسلامی سیاسی میسری بدەین و پەیوەندیان بەقاعیدەوە ڕوون بکەینەوە، ئەوانیش جەماعەتی ئیسلامی (الجماعة الاسلامية) و ڕێکخستنی جیهاد (تنظيم الجهاد)ی میسرین.

أ- **الجماعة الاسلامية المصرية:** ئەم کۆمەڵەیە لە سەرەتاکانی دروستبوونیەوە باوەڕی بە جیهادکردن لەدژی حکوومەتە لۆکاڵیەکەی خۆیان هەبووە. هیچ مەیلێکی چالاکی سنووربەزێنیان نەبووە، بەڵام دوای ئەوەی ئەم گروپە کەوتە ژێرکاریگەری بیری توندڕەوی لە ساڵی ١٩٨٥ هەوڵی تیرۆرکردنی سەرۆکی میسری (حوسنی موبارەك)یان دا، بەڵام لەو هەوڵانەیان سەرنەکەوتن و پاشەکشەیەکی سیاسی و ڕێکخستنی گەورەیان کرد. لە دیارترین سەرکردەکانی جەماعەی ئیسلامی میسری (رفاعی احمد طه) و (مصطفى حمزة) کە پەیوەندیان بەڕێکخراوی قاعیدە بەهێزبوو. (رفاعی احمد طه) ساڵی ١٩٩٨ لەسەر بەیانی (بەرەی ئیسلامی بۆ دژایەتی کردنی یەهود و سەلیبییەکان) ئیمزای کرد، کە ئوسامە و زەواهیری ڕێکخەری سەرەکی ئەم بەرەیە بوون. رفاعی دواتر لە ژێر فشاری سەرکردەکانی دیکەی (جماعە) لە بەرەی ناوبراو هەر لە هەمان ساڵ کشایەوە. سەبارەت بەپەیوەندی (جماعة الاسلامية) لەگەڵ ئوسامە، خودی ئوسامە لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ کەناڵی ئەلجەزیرە کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٨ سازکرابوو، گوتی: (پەیوەندی برایەتی، ئێمە بە جماعەی ئیسلامی میسری دەبەستێتەوە، ئێمە بەفەزڵی خودا هەر لە سەرەتاکانی شەڕی جیهاد دژ بە

---

[1] الافغان العرب محاولة للتعريف – د. نشأت حامد عبدالماجد، مصدر: الاسلام اون لاين.

سۆڤیەت لەیەك سەنگەردا جەنگاوین، هەروەها جەماعەی ئیسلامی هەڵوێستێکی مەردانەیان نواند کاتێ لەسەر فتوای (حەڵاڵکردنی خوێنی ئەمریکییەکان) ئیمزایان کرد، بەڵام هەندێ کەس دەرکردنی ئەم بڕیارەیان بەوە لێکدایەوە کە ئەوان بەشێکن لە (بەرەی ئیسلامی جیهانی) بەتایبەتی سەرکردەکانی جەماعە. بۆیە ئەوان لەسەر فتواکەیان پەشیمان نین بەڵام بوونە بەشێك لە بەرەکەی تێکەڵاوی دروستکردووە)[1].

ب- ڕێکخستنی جیهاد:

هەرچەندە ڕێکخستنی جیهادی میسری پشتی بە ئایدیۆلۆژیای شەڕکردن دژ بە دوژمنی نزیك (حکوومەتی میسر) بەستبوو پێی باشتربووە لە دوژمنی دوور (ئەمریکا و یەهود) کە لە کتێبێکی (محمد عبدالسلام) بەناوی (الجهاد: الفريضة الغائبة) دەبەست، بەڵام کاتێ سەرکردەی جیهاد (ئەیمەن زەواهیری) لە یەکەم سەردانی بۆ ئەفغانستان لە ساڵی ١٩٨١ و دواتر لە ساڵی ١٩٨٥ بە یەکجاری لەتەك جیهادی ئەفغانی مایەوە. ئەوەبوو ساڵی ١٩٩٨ ئیمزای لەسەر بەیانی (بەرەی ئیسلامی جیهانی دژ بە یەهود و ئەمریکا) کرد، بەمەش لەو ئایدیۆلۆژیایەی کە لە سەرەتاوە کاریان پێدەکرد، دوورکەوتنەوە. ئەمەش لەبەر چەندین هۆکار کە زەقترینیان ئەمانەن:

یەکەم: کێشە و ململانێی نێوان ڕێکخستنی جیهاد و کۆمەڵی جیهاد، دووەم: تەنگژەی دارایی و ماددی کە تووشی ڕێکخراوەکە بوو، سێیەم: هەوڵە سەرنەکەوتووە یەك لەدوای یەکەکانی جیهاد لە تیرۆرکردن و پرۆسەی گۆڕینی حوکم لە میسر، چوارەم: گوشاری زۆری دەزگا ئەمنی و سوپاییەکانی میسر و دەستگیرکردنی زۆر لە ئەندامە چالاکەکانی ئەم گروپە.

---

[1] معالم في طريق العنف والمراجعة: تنظيم الجهاد – القاعدة – جزء ٦، تأليف ضياء رشوان، مركز الاهرام للدراسات السياسية والاستراتيجية.

لێرەدا دەکرێت ئەو ئەفغانە میسریانەی کە لە تۆڕی ڕێکخراوی قاعیدەدا کاریان کردووە بۆ دوو قۆناغ دابەش بکەین:

قۆناغی یەکەم: ئەوانەی لە سەرەتای شەڕی ئەفغانەوە لەگەڵ سەرۆکەکەیان (زەواهیری) بۆ ئەفغانستان چوون، هەندێك لەوانەی توانیان دووربەدوور سوود لە لایەنی ماددی ئوسامە وەربگرن و لە چالاکی توندوتیژی ناو میسر سوودی لێوەربگرن. بەڵام ئەو هەوڵانەی جیهاد هەمووی بەهەدەر چوو.

قۆناغی دووەم: لە دوای مۆرکردنی (بەرەی ئیسلامی جیهانی) لەلایەن زەواهیریەوە دەست پێدەکات، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ڕێکخستنی جیهاد دووکەرت ببێ و ڕێکخستنی دەرەوەی جیهاد چوونە ژێر دەسەڵاتی ئەیمەن زەواهیری و ڕێکخستنەکانی ناوەوەش چوونە پاڵ کۆمەڵی ئیسلامی و دەستبەرداری کاری توندوتیژی بوون. ئیتر لەمە بەدواوە ڕێکخستنی جیهاد دەبێتە بەشێك لە بەرەی جیهانی ئیسلامی و ناوی لەپاڵ کارو چالاکییەکانی ئوسامە بن لادن دێت.

**ئەمەش نموونەیەك لەو ئەفغانە میسریانەی سەروکاریان لەگەڵ قاعیدەدا هەبوو:**

١- ابو مصعب ڕۆیتەرز: ناوی ڕاستەقینەی (عبدالمقصود)ە، بە بەرپرسی ڕاگەیاندن لە ڕێکخراوی قاعیدە دادەنرێت، سەرەتا چۆتە پاکستان، دواتر چۆتە ئەفغانستان، دوای ڕووداوی ١١ی سێپتێمبەر لەگەڵ هەندێ سەرانی قاعیدە، ئەفغانستان بەجێدێڵێ، بەڵام لەم ڕاکردنەی سەرکەوتوو نابێت، لەسەر سنووری ئەفغانستان دەستگیر دەکرێت و تەسلیم بەدەسەڵاتدارانی میسر دەکرێتەوە.

ابو مصعب ڕۆیتەرز لەکاتی پەڕینەوەی لە سنووری ئەفغانستان بەهۆی مینێکەوە قاچێکی لە دەست دەدات. یەکێ بووە لەوانەی لە سەردەمی شەڕی دژ بە سۆڤیەت بەشداری شەڕی ئەفغانستانی کردووە، یەکێك بووە لە ئەندامانی (الجماعة الاسلامية المصرية).

له ماوەی مانەوەی له ئەفغانستان سەرپەرشتی دەرکردنی گۆڤارێك بووە بەناوی (الموحدون). سەبارەت بە نازناوی ڕۆیتەرز، ئەمەش له بەرئەوە بووە کە له (بیاسور) له پاکستان بڵاوکراوەیەکی بەناوی (بڵاوکراوەی هەواڵەکان) دەردەکرد و هەرچی هەواڵ و چالاکی ئیسلامی ڕاگەیاندنەکانی جیهان هەبوو، تێیدا بڵاودەکرایەوە، بۆیە هاوەڵانی بە(ڕۆیتەرز)ناویان دەبرد[1].

٢- عصام دراز: ساڵی ١٩٨٦ هاوەڵی ئوسامە بوو، لەناو ئەو فڕۆکەیەی کە بۆ شاری (پیشاوەر) دەچوو، ئەو فڕۆکەیە کەوتە خوارەوە ١٣کەسی تێدا مردن، بەڵام (دراز) بە سەلامەتی دەرچوو. ئەوکات خەڵکی پرسیاری ئەوەیان کرد، دەبێ ئەو میسریە لەسەر سنووری ئەفغانستان چی بکات و بۆچی چوبێتە ئەوێ. دراز کۆنە ئەفسەری سوپای میسری بوو، ئەم پیاوە لە بواری فیلمسازی کاری دەکرد، بۆیە کە گەڕایەوە میسر فیلمێکی دیکیۆمێنتی بە ناوی (ئەفغانە عەرەبەکان... سەرەتا و کۆتایی) و چەند کتێبێکی لەسەر شەڕی ئەفغان بڵاوکردەوە. دراز لە گەڕانەوەی بۆ میسر، دەسەڵاتداران سەفەریان لێ قەدەغەکرد، ئەم پیاوە زۆر نهێنی قاعیدەی لابوو، زۆر ناوی سەرانی قاعیدەی بۆ دەسەڵاتدارانی میسر درکاندووە، لەوانە (ئەبو قتیبەی سوری) کە لە شەڕی (١٩٨٩) کوژرا، هەروەها (ئەبو زوبێری سعودی) کە لە شەڕی (بۆسنە کوژرا) و(شەفیق مەدەنی سعودی) و (یاسین کوردی(عیراق)) کە پسپۆڕی بۆندی بازرگانی چەك بوو.

لەبەرئەوەی (دراز) وێنەگری تایبەتی ئوسامە بوو، دەڵێ سەرەتا ئوسامە دژی وێنەگرتن بوو، بەڵام دواتر توانیم ڕازی بکەم بێتە ناو شەڕی ڕاگەیاندنەوە، هەروەها دەڵێ لەماوەی ساڵانی ١٩٨٦ تا ١٩٩٠ من یەکەم کەس بووم توانیم وێنەیەکی فۆتۆگرافی ئوسامە بگرم و توانیم یەکەم گفتوگۆی لەگەڵ سازبکەم، دوای شەڕی (جلال ئاباد ١٩٨٩) بەو بۆنەوە کە سەرۆکی (مأسدە الانصار

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٧٨٣، سنة ٢٠٠٢.

العرب) بوو، ئەمەش گروپێکی جەنگاوەرانی لاوانی عەرەب بوون، ئەوکات ئوسامە تەمەنی ٢٨ساڵان بوو[1].

٣- ابو حفص المصری (محمد عاطف): بەرپرسی سەربازی قاعیدە و زاوای بن لادن بوو. بەیەکێك لە دامەزرێنەرانی قاعیدە دادەنرێت، دوای مردنی (ابو عبیدە البنشیری – علی امین الرشیدی) سەرکردایەتی سەربازی قاعیدەی لە ئەستۆ گرت، ساڵی ٢٠٠١ لە میوانخانەی یەرموك (مضافة الیرموك)کە بنکەی سەرکردەی ئەفغانە عەرەبەکان بوو لە ئەفغانستان لەگەڵ ١٤ کەسی دیکە لە لایەن فڕۆکە جەنگیەکانی ئەمریکاوە دەکوژرێت. ابو حفص المصری سێیەم کەسایەتی ناو قاعیدەیە (دوای ئوسامە و زەواهیری) کە ئەمریکییەکان بە دوای دەگەڕێن، ئەمەش بە تۆمەتی ئەوەی کە دەستی لە تەقاندنەوەی هەردوو سەفارەتی ئەمریکی لە ئەفریقیا دا هەبوو، چونکە (محمد عاطف) بەردەوام لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە پەیوەندی بەوکەسانەوە کردووە کە هەردوو سەفارەتی ئەمریکی لە(نایرۆبی و داروسەلام) لە ئابی ١٩٩٨ تەقاندەوە، هەروەها چاوی بەجێبەجێکاری هێرشەکانی پیشاوەری پاکستان کەوتووە و ماوەیەك بەرپرسی سەربازی قاعیدە و سەرپەرشتیاری ڕاستەوخۆی مەشقی (ئەفغانە عەرەبەکان)ی لە سەربازگەکانی بن لادن کردووە، هەروەها محمد عاطف (ابو حفص المصری) ڕاوێژکاری ڕاگەیاندنی بن لادن بووە، لە میسر بە تۆمەتی گەڕاوەکانی ئەفغانستان (العائدون من افغانستان) تۆمەتبار کراوە[2].

١- ابو عبدالرحمان الالکترونی: ناوی ڕاستەقینەی (محمد عبدالرحیم محمد الشرقاوی)ە تەمەنی ٥٥ ساڵە سەرباری ئەوەی خاوەن ڕەگەزنامەی پاکستانییە، بەڵام لەبەرئەوەی بەئەسڵ میسریە، دەسەڵاتدارانی پاکستانی لە ئازاری ١٩٩٥

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٦٩٨، سنة ٢٠٠٢.

[2] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٧٥٩، سنة ٢٠٠٢.

تەسلیمی میسری دەکەنەوە، لە میسر دەست بەسەر دەکرێت. ئەم پیاوە بە بازرگانیکردنی ئامێری هەندەسەی ئەلیکترۆنی لە پیشاوەر خەریکبوو، هەروەها لە نووسینگەی ئاوەدانکردنەوەی ئەفغانستان (مکتب تعمیر افغانستان)یش کاریدەکرد. (شەرقاوی) سەر بە (جماعەی جیهادی میسری) بوو، بەڵام لە سەرەتای نەوەدەکانەوە لەم کۆمەڵەیە جیا بووەوە.

ئەیمەن زەواهیری سەرۆکی کۆمەڵی جیهادی میسری لەکتێبەکەیدا سوارچاکانی ژێرئاڵای پێغەمبەر (فرسان تحت راية النبي) دا، ئاماژە بە دوکانەکەی شەرقاوی دەکات و دەڵێت: (سەرکردەی کۆمەڵی جیهادی میسری، ئەفسەری هەڵاتوو، (عصام القمری) لەگەڵ هاوەڵەکەی (نبیل عبدالنعیم) لە دوکانەکەی شەرقاوی خۆیان حەشاردا، پێش ئەوەی هێزەکانی ئاسایش لە هەشتاکان بچێتە ناو دوکانەکەوە[١].

٢–سیف العدل المصری: سەرکردەی سەربازی قاعیدەیە، ئەمریکا ٢٥ ملیۆن دۆلاری تەرخان کردووە بۆ ئەو کەسەی زانیاری بدات بۆ دەستگیرکردنی، کچی سەرکردەیەکی کۆنی گەورەی ئەفغانە عەرەبەکانی (ابو ولید) هێناوە کە میسریە، زۆرجار ناوی لەگەڵ (محمد ابراهیم مکاوی) کە ئەویش (عقیدێکی میسرییە) تێکەڵاو دەکرێت، بەڵام (یاسر السری) بەڕێوەبەری (مرصد الاسلامی) کە سایتێکە گرنگی بە هەواڵی جیهادی دەدات و بارەگاکەی لە لەندەنە دەڵێت ئەمانە دوو کەسی لێکجودان[٢]. سیف العدل لە یاداشتەکانی سەبارەت بە بۆردومانی ئەمریکی بۆسەر ئەفغانستان، کە لە گۆڤاری (صوت الجهاد) دا بڵاوکرایەوە، دەنووسێ: بەکارهێنانی ژمارەی تەلەفۆنی لە ڕێگەی سەتەلایت بە نەزانی وایکرد شوێنی ئەفغانە عەرەبەکان لە قەندەهار بۆ ئەمریکییەکان ئاشکرا

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٩٤٠٠، سنة ٢٠٠٤.

[2] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٩٢٥٧، سنة ٢٠٠٤.

بێت ئەمەش وایکرد لەلایەن فڕۆکەکانی ئەمریکاوە بەرۆکێتی کرۆز بۆردومان بکرێن[1].

٣-ابو محمد المصری: بە ناوی (عەبدوڵڵا ئەحمەد عەبدوڵڵا) کاری دەکرد و تەمەنی ٤٢ ساڵ دەبێت، سەرپەرشتی سەربازگەکانی قاعیدەی لە ئەفغانستان، لە نێوانیان سەربازگەی (فاروق) دەکرد. دەستی لە تەقاندنەوەی هەردوو باڵیۆزخانەی ئەمریکی لەکیشوەری ئەفریقیا هەبووە.

٤- محمد الظواهری: برای ئەیمەن زەواهیریە. دوای ئەیمەن زەواهیری سەرکردایەتی بزووتنەوەی جیهادی میسری کردووە، چۆتە پاکستان و ئەفغانستان و سودان، ماوەیەکی زۆر بە چڕی لە پاڵ براکەی و ئوسامە دا ژیاوە و کاریکردوە. ساڵی ٢٠٠٢ لەلایەن دەزگای ئەمنی میسرییەوە دەستگیر دەکرێت. شایەنی باسە دەوڵەتی ئیماراتی عەرەبی پێش چەند ساڵێك محمد زەواهری تەسلیمی دەسەڵاتدارانی میسر کردۆتەوە، بەڵام ناوبراو هیچ زانیاریەکی لەمەڕ پەیوەندی براکەی بە ئوسامەوە نەدرکاندوە.

٥- حمزه مدحت المرسی: بە (ابو خباب) ناسراوە، کوڕی (مدحت مرسیه) کە هەندێ پێیانوایە دوای (اسامه و زەواهیری) کەسی سێیەمی ناو قاعیدەیە. ئیسلامییەکان دەڵێن ابو خباب ئەندازیاری کیمیاییە و بەرپرسی چەکی کیمیایی ناو قاعیدە بووە. لە پاکستان دەستگیر دەکرێت و تەسلیم بە میسر دەکرێتەوە.

٦-اسماعیل سید امام الشریف: سەرۆکی پێشووی ڕێکخستنی جیهادی ئیسلامی میسری بوو بە (دکتۆر فضل) ناسراوە، لە سەرەتای هەشتاکانەوە بۆ پاڵپشتی خەباتی ئەفغانی چووە و وەك برینپێچ کاری کردووە. شەریف وازی لە جیهادی میسری هێناوە دوای ئەوەی جیهاد دەستی دایە هەڵمەتی چەکداری دژی دەسەڵاتدارانی میسری. دوای ئەویش (ئەیمەن زەواهیری) دەسەڵاتی جیهادی میسری گرتەدەست، شەریف لە یەمەن دەستگیر دەکرێت و تەسلیم بە میسر دەکرێتەوە.

---

[1] جریدة الشرق الاوسط، العدد ٩١٠١،سنة ٢٠٠٣.

٧- ابو طلال القاسمي: قسەکەری ڕەسمی بەناوی (الجماعة الاسلامية) میسری بوو. سەیارەیەکی بەمین چێنراوی لەیەکێ لە بارەگاکانی پۆلیسی شاری (ریبکا)ی کرواتی تەقاندەوە، دوای ئەمە وون بوو، بەمەش زەبرێکی کوشندە بەر (جماعە) کەوت[1].

٨-شوقی محمد سلام عطية: بەرپرسی ڕێکخستنی (تیرانا)ی قاعیدە بوو. ساڵی ١٩٩٩ لەگەڵ (٤٤)کەسی دیکە لە میسر دادگایی دەکرێن و ناوی (گەڕاوەکانی ئەلبانیان)یان لێدەنرێت، کە زۆربەیان سەربە (جماعە الجهاد) و کەمێکیشیان سەربە (قاعیدە) بوون. بۆیە ئەم ناوەشیان بەسەردا بڕا، چونکە چوار لە سەرکردە دیارەکانیان میسری بوون. یەکێك لەوانە (شوقی محمد سلام) بوو، ئەمانە ساڵی ١٩٩٨ حکوومەتی ئەلبانیا تەسلیم بە حکوومەتی میسری کردنەوە[2].

**ئەو کردەوە توندوتیژیانەی ئەفغانە عەرەبەکان لە میسر ئەنجامیان داوە:**

أ- ئەو عەرەبە ئەفغانە میسرییانەی کە پەیتا پەیتا دوای بینینی مەشقی چڕوپڕی سەربازی و عەقائیدی لە ئەفغانستان دەگەڕانەوە میسر، دەستیان دایە چەند چالاکییەکی توندوتیژ، ئەوەبوو ساڵی ١٩٨٩ هەوڵی تیرۆرکردنی وەزیری ناوەخۆی میسر (زەکی بەدر)یان دا[3].

ب- ساڵی ١٩٩٠ د. رفعت المحجوب- یان تیرۆرکرد کە سەرۆکی پەرلەمانی میسری بوو[4].

ج- ساڵی ١٩٩٣ هەوڵی تیرۆرکردنی (حسن الالفی) وەزیری ناوەخۆ و (صفوت الشريف) وەزیری ڕاگەیاندنیان دا[5].

---

1 الافغان العرب محاولة للتعريف... د. نشأت حامد عبدالماجد، اسلام اون لاين.
2 الافغان العرب – اعداد عبدالعاطى، المصدر جزيرة نت.
3 هەمان سەرچاوە.
4 الافغان العرب محاولة للتعريف، هەمان سەرچاوە.
5 هەمان سەرچاوە.

د- ساڵی ١٩٩٥ ئەفغانە میسریەکان چوار چالاکی دیاریان لە میسر ئەنجامدا.

١- تیرۆرکردنی بەرپرسی بازرگانی لە باڵیۆزخانەی میسر لە سویسرا.

٢- تەقەکردن لە کۆمەڵێ دیبلۆماتی میسری لە (مەدرید).

٣- هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی سەرۆك (حسنی موبارەك) لە ڕووبەڕووبوونەوەی دەزگا ئەمنییەکانی میسر و ئەفغانە عەرەبەکان، کە بۆ دەسەڵاتدارانی میسر دەرکەوت، ئەوانە دەستی دەرەکی و پاڵپشتی دەرەکیان بەهێزە. ئەم هەوڵەی تیرۆرکردنە بووە هۆی تێکچوونی پەیوەندی میسر لەگەڵ سودان و ئەسیوپیا و پاکستان. ئەوەی ئەو هەوڵی تیرۆرکردنەی ئەنجامدا کۆمەڵێ ئەفغانی عەرەبی سەربە (جماعە الاسلامیە)ی میسری بوون کە (مصطفی همزة) سەرکردایەتی دەکردن، هەروەها بۆ دەسەڵاتدارانی میسر بە دەرکەوت کە ئەمانە توانایەکی بەهێزیان لە چالاکی نواندن هەیە، چونکە مەشقی چڕوپڕیان لە ئەفغانستان بینیوە[١].

٤- لە نۆڤێمبەری ساڵی ١٩٩٥ سەفارەتی میسریان لە (ئیسلام ئاباد) تەقاندەوە.

ئەم چالاکییانەی ئەفغانە میسرییەکان لە ساڵی ١٩٩٥ دوای ئەوە هات کە هێزە ئەمنییەکانی میسر گورزی گەورەیان لە ڕێکخستنەکانی ڕەوتە ئیسلامییە توندڕەوەکان دا بۆیە ئەمانە چالاکییەکانیان دژ بە میسر گواستەوە دەرەوە، بەڵام ئەمە وایکرد پەیوەندی ئەمنی میسر لەگەڵ دەوڵەتان بەهێزبێت بەتایبەت لەگەڵ ئەمریکا و پاکستان و چەندین دەوڵەتی عەرەبی و ئەورووپی[٢].

هـ- ساڵی ١٩٩٧ کوشتارگەی ئەقسر (مذبحة الاقصر) یان ئەنجامدا[٣].

و- ساڵی ٢٠٠٤ زنجیرە تەقینەوەکانی سینایان ئەنجامدا[٤].

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٩٤٤٧، سنة ٢٠٠٤.
[2] هەمان سەرچاوە.
[3] الافغان العرب محاولة للتعريف، هەمان سەرچاوە.
[4] هەمان سەرچاوە.

## ئەفغانە عەرەبەكان و توندوتیژی سیاسی لە جەزائیر

ئەفغانە جەزائیرییەکان ڕۆڵێکی گەورەیان لەپاڵ گروپە ئەفغانییەکان لەکاتی داگیرکاری سۆڤیەت بۆ ئەفغانستان گێڕاوە، ئەمانە ڕۆڵێکی گرنگیان لە دامەزراندنی کۆمەڵەی ئیسلامی چەکداری بینیوە، بۆ نموونە (عنتر الزوابری) کە سەرکردەی کۆمەڵێکی ئیسلامی چەکدارە، کە پێشتر لە ئەفغانستان جیهادیان کردووە، دوای کەوتنی حکوومەتی (نجیب الله) بۆ جەزائیر گەڕاونەتەوە. بەگوێرەی هەندێ سەرچاوە، ژمارەی ئەفغانە جەزائیرییەکان لە ئەفغانستان دەگەیشتە چەند سەد کەسێك.

بۆ تێگەیشتن لە چۆنیەتی دروست بوون و گەشەسەندنی ئەم دیاردەیە، پێویستە بۆ سەرەتاکانی ساڵی ١٩٧٩ بگەڕێینەوە. دوای ئەوەی سەرۆك (شاذلی بن جدید) جڵەوی دەسەڵاتی لە جەزائیر بەدەستەوە گرت، چاوپۆشی لە گەشەسەندنی ئەم دیاردەیە کرد، ئەمەش بۆئەوەی گورز لە هەوادارانی (بۆمدین)ی سەرۆکی پێشوو بوەشێنێ، کە مەیلی چەپڕەویان هەبوو، لەم نێوەشدا (الحركة الاسلامية الجزائرية) گەشەی سەند و سەرانی ئەو بزووتنەوەیە (عبداللطيف سلطاني و احمد سحنون و عباسی مدني) یەکگرتووی خۆیان پیشاندا و ئەم بزووتنەوەیە لە سەرەتای هەشتاکانەوە داوای گەورەترین کۆبوونەوەی جەماوەریان لە پایتەخت کردو هەزاران کەس بەشدارییان تێدا کردو داوایان لە ڕژێمی (الشاذلی) کرد، پەشێوی لەناوبەرێت و شەریعەتی ئیسلامی جێبەجێ بکات. هەر لەپاڵ ئەو ڕەوشە ڕوو لە سەرە ئیسلامییەی جەزائیر، یەکەمین بزاڤی ئیسلامیی چەکدار لە جەزائیر لەلایەن (مصطفى بويعلى) کۆنە ئەفسەری پێشووی سوپای جەزائیرەوە دامەزرا، ئەم بزاڤە داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی لە جەزائیر دەکرد.

ڕەوتە ئیسلامییەکانی جەزائیر (چ عەسکەری چ سیاسی) پشتگیری کێشەی ئەفغانستانیان دەکرد، مەسەلەی داگیرکاری سۆڤیەت بۆ ئەفغانستان بابەتی وتاری هەینی مزگەوتەکان بوو، کاسێتەکانی (عەبدوڵڵا عەزام) لەسەر کێشەی ئەفغانی ئەم دەست ئەو دەستی دەکرد، هەندێ خوێندکاری زانکۆکانی (مەدینە و مەککە) ڕۆڵێکی بەرچاویان لە هاندان و ئاراستەکردنی لاوانی جەزائیری بۆ چوونە ئەفغانستان هەبوو. ئەمەش لەسەر بنەمای بڕوابوون بە(ئەوەی گرنگی بەکاروباری موسوڵمانان نەدات لە موسوڵمانان نییە)، دەسەڵاتدارانی ئەوسای جەزائیریش هێندە گرنگیان بەکۆچی لاوانی جەزائیری بۆ ئەفغانستان نەدەدا، بەڵکو هەندێ جاریش پێیان باش بوو، ئەمەش لەبەر دووهۆکار:

یەکەم: دەسەڵاتدارانی جەزائیری پێیان باش بوو، بزووتنەوەی ئیسلامی جەزائیری لە قۆناغی بانگەشەکردن دەربچێ بۆ قۆناغی توندوتیژی، ئەمەش بۆ ئەوەی بیانوی ئەوەی بەدەستەوە بێت سەرکوتی بکات.

دووەم: یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو، ئەوکات بۆ جەزائیر هیچی نەدەگەیاند، لە سەردەمی (شارلی بن جدید) جەزائیر بەدوای باشترکردنی پەیوەندییەکانی بە خۆرئاواوە دەگەڕا. هەر لەو سەردەمە بوو (شازلی) بە وتەکەی لە سەردانێکی بۆ USA لە سەردەمی (ڕیگن)دا گوتبووی (ئێستا دەزانم بەرژەوەندی جەزائیر لە کوێیە) ناوبانگی دەرکرد بوو. گەنجانی جەزائیری لە ڕێگەی پاکستان و هەندێ وڵاتانی ئەوروپی (وەك فەرەنسا و ئیسپانیا) بەرەو ئەفغانستان دەچوون، هەندێکیشیان لە جەزائیرەوە بۆ سعودیە و پاکستان و ئینجا بۆ ئەفغانستان دەچوون، ئەوانەی لە ڕێگەی شانشینی عەرەبی سعودی بۆ پاکستان دەچوون، هەڵگری پاکانەی ئەو کەسایەتییە سعودیانە بوون کە لە دەزگاو دامەزراوە ئیسلامییەکانی سعودیە کاریان دەکرد[1]. بەگوێرەی هەندێ سەرچاوەی نیمچە

---

[1] الاسلاميون الجزائريون وادوارهم بين الماضي والحاضر، يحيى ابو زكريا، سايتی ايلاف، ٢ اغسطس ٢٠٠٥.

فەرمی ژمارەی ئەوانەی بۆ ئەفغانستان چوون لە نێوان (٢-٤) هەزار کەس دەبوو. ئەمانە لە ئەفغانستان بەگوێرەی بیروڕایان بەسەر گروپە ئیسلامییەکانی ئەفغان دابەش بوون. دوای کەوتنی حکوومەتەکەی (نجیب الله) زۆرێك لە ئەفغانە جەزائیرییەکان بۆ جەزائیر گەڕانەوە، هەندێك لەمانە هەر لەسەر سنوور دەستگیرکران، هەندێکیش لە سنوورەکانی (مەغریب و تونس)ەوە بۆ ناو جەزائیر دزەیان کرد.

ناوی ئەفغانە جەزائیرییەکان لە دوای هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکەی جەزائیر ساڵی ١٩٩٢ هاتە نێو میدیاکان، کاتێ (جبهة الانقاذ الاسلامی) لەو هەڵبژاردنانەدا زۆرینەی دەنگەکانی بەدەست هێنا و حکوومەت ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنەی ڕەتکردەوە. ئەو ئەفغانە عەرەبانەی دوای ڕەتکردنەوی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان بۆ جەزائیر گەڕانەوە زۆربەیان دایانە پاڵ (الجماعة الاسلامیة المسلحة) کە لە ساڵی ١٩٩٢ دامەزراو و بەناوی (جیا) ناسرا[١]. ئەو (جماعة اسلامیة مسلحة)ش توندڕوترین ڕەوتی ئیسلامی جەزائیر بوو، کە لە سەردەستی (محمد علال) ناسراو بە(محمد لیفیه)کە ساڵی ١٩٨٥لە بەندیخانە رایکرد بوو، بۆ چیاکان چوو بوو، لەوێ بنکەی یەکەم شانەی چەکداری دامەزراند، جەماعەتی تەکفیر و هجرە (جماعة التکفیر والهجرة)ش کە لە ئەفغانستان دامەزرا بوو، چوونە پاڵیەوە[٢]. زۆر کەس سەرکردایەتی (الجماعة الاسلامیة المسلحة) یان گرتە دەست، لەوانە عبدالحق العیایدە، کە لەلایەن دەسەڵاتدارانی مەغریبییەوە لە ساڵی ١٩٩٣ دەستگیر کرا، دوای ئەویش (جعفر الافغانی) کە دوو ساڵ مەشقی لە ئەفغانستان بینیوە و بەشداری شەڕی دژ بەسۆڤیەتی کردووە و بە توندوتیژ ناسراوە، زۆربەی چالاکییە تیرۆرستییەکانی جەزائیری خستۆتە ئەستۆی

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] الافغان العرب، محمد عبدالعاطی، مصدر جزیرة.

کومەڵەکەی، ئەو ئەفغانە جەزائیرییانە کۆمەڵێ کردەوەی تیرۆرستی و توندوتیژیان لە جەزائیر نواندووە، ئەمانە گرنگترینیانە:

١- تۆمەتبارن بەکوشتنی دەستەیەك لە ڕۆشنبیران و کارمەندانی دەوڵەت و ڕۆژنامەنووسان.

٢- ڕفاندنی ئەندامانی باڵیۆزخانەی فەرەنسی لە جەزائیر ساڵی ١٩٩٣.

٣- هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی وەزیری بەرگری پێشوو (خالد نزار).

٤- تۆمەتبارن بە تەقاندنەوەی فڕۆکەخانەی (هواری بودین) لە ساڵی ١٩٩٣.

٥- (جیا) بەر پرسیارێتی خۆی لە کوشتنی (١٢)کرواتی ڕاگەیاندوە.

٦- تۆمەتبارن بە ڕفاندن و کوشتنی (محمد بوسلیمانی) گەورە سەرکردەی ئیخوانی جەزائیری.

٧- هەروەها ئەم گروپە فرمانی لە سێدارەدانیان بەسەر سەرکردەکانی (جبهة الانقاذ) ئەوانەی لە دەرەوە دەژین دا سەپاند.

ئەفغانە جەزائیرییەکان سوودیان لەو پەیوەندییە باشەی نێوان خۆیان و گروپە ئەفغانییەکان بۆ دەستکەوتنی چەك، وەرگرت. چالاکی ئەفغانە جەزائیرییەکان بەگوێرەی ڕاپۆرتە فەرەنسییەکان بۆ ناو خاکی فەرەنساش گوازراوەتەوە. ئەمانە توانیویانە سەدان گەنجی ئیسلامی فەرەنسی بۆ ناو ئەفغانستان بگوازنەوە و دواتریش چالاکی توندوتیژی لە فەرەنسا ئەنجام بدەن.

دوای شەڕ ڕاگرتنەکەی (هدنە) کە (الجبهة الاسلامیة للانقاذ) ساڵی ١٩٩٧ ڕایگەیاند، چالاکییە چەکدارییەکان ڕوویان لەکزی کرد، لەولاشەوە سەرکردە ئەفغانییە جەزائیرییەکان لە ڕێگەی (قمرالدین خربان) سەرکردەی ئەفغانە عەرەبەکان، کە پەیوەندیەکی بەتینی بە ئوسامە بن لادنەوە هەبوو، ئەو پەیوەندیەش بۆ ئەوکاتە دەگەڕێتەوە کە (خربان) بەرپرسی بنکەکانی مەشقی ئەفغانە عەرەبەکان بوو لە پیشاوەر، ئەمانە هەوڵی ئەوەیان دەدا ئەو شەڕ ڕاگرتنەی کە سوپای (انقاذ) ڕایانگەیاندبوو، لەباربەرن، ئەمەش لە ڕێگەی

کۆکردنەوەی ڕەوتی سەلەفی، بۆ ئەم مەبەستەش نووسینگەی هەماهەنگی (المکتب التنسیقی للانقاذ في اوروبا) یان ساڵی ١٩٩٩ بەقسەی (خربان) دامەزراند، سەرۆکایەتی ئەم نووسینگەیەش درا بە (احمد الزاوی)، دواتر ئەفغانە جەزائیرییەکان بوونە (الجماعة السلفیة للدعوة والقتال) کە توندوتیژترین گروپی چەکداریی جەزائیر بوو، زۆربەی ڕاپۆرتەکان ئاماژە بە پەیوەندی قوڵی نێوان ئەمانە و بن لادن و تالیبان دەدەن[1].

ئەو جەزائیریانەی کە لە ئەفغانستان مانەوە، هەندێکیان بوونە بەشێك لە ڕێکخراوی قاعیدە، کەمێکیشیان توانیان خۆیان بگەیەننە ئێران و لە (الحوزات العلمیه) نیشتەجێ بن بەتایبەتی لە شاری (قم)، هەندێکیشیان لە قوتابخانە ئاینییەکانی پاکستان بە لێکۆڵینەوەی شەریعەتی ئیسلامییەوە خەریك بوون[2].

ئەفغانە جەزائیرییەکان هەر لەناو جەزائیر ڕۆڵیان نەبووە، بەڵکو لە پاکستانیش دەسەڵاتداران، (ابو سلیمان) ناوێکیان گرتووە کە ئیسلامییەکی جەزائیرییە و بەرپرسی ڕێکخستنەکانی قاعیدە بووە لە شاری (پیشاوەر)، ابو سلیمان یەکێکە لەو ئەفغانە عەرەبانەی کە لە سەرەتای شەڕی ئەفغانەوە بەشداری کردووە، دەستێکی لەو شەڕانەدا لەدەست داوە[3].

## ئەفغانە عەرەبەکان و توندوتیژی سیاسی لە شانشینی عەرەبی سعودی

وەکو لە بەشەکانی پێشوو باسمانکرد، کاتێ لاوە عەرەبەکان ڕوویان لە ئەفغانستان دەکرد، سەرەتا لە پیشاوەری سەر سنووری پاکستان – ئەفغانستان بۆ ماوەیەك دەمانەوە، بۆ ئەوەی مەشقی سەربازی و عەقائیدی ببینن. هەموو

---

[1] الافغان العرب، محاولة للتعریف، د.نشأت حامد عبدالماجد، اسلام اون لاین.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] الاسلامیون الجزائیریون وادوارهم... هەمان سەرچاوە.

گروپە ئیسلامییەکان (پیشاوەر)یان بەزەویەکی بەپیت بۆ گەشەسەندنی بیروڕایان و چالاکییەکانیان دەزانی، لەوێ ڕەوتە ئیسلامییە جیاجیاکانی جیهان چاویان بەیەکتر دەکەوت. کۆمەڵی ئیسلامی میسر و ئیسلامییە هەڵاتووەکانی سوریا و باکووری کیشوەری ئەفریقیا (لیبیا و جەزائیر) خاڵی هاوبەشی نێوان ئەو ئیسلامییانە ئەوەبوو کە مەحروم بوون لەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکەیان. هەرچی ئیسلامییەکانی سعودیە و دوورگەی عەرەبی و یەمەنییەکان بوون، ئەمانە لەلایەن وڵاتەکانیان ڕاوەدوو نەنران و لە حکوومەتی خۆیان هەڵنەهاتوون، ئەوانە بەخواستی ئازادانەی خۆیان و بەدەستخۆشی وڵاتەکەیان بۆ ئەفغانستان هاتوون.

لاوە سعودییەکان پێش ئەوەی بۆ ئەفغانستان بێن سەر بە هیچ پارت و ڕێکخراوێکی سیاسیی ئیسلامی نەبوون. ئەمانە لەژێر کاریگەری چڕی بانگەشەکردن بۆ جیهادی ئەفغانی بۆ ئەفغانستان هاتبوون. کەمێك لەو لاوە عەرەبە سعودیانە لەوە دەگەیشتن کە شەڕی ئەفغان هەرچیەك بێت لە چوارچێوەی شەڕی ساردی نێوان (سۆڤیەت - ئەمریکا) دەرناچێت. زۆربەی ئەوانەی لە سەرەتای هەشتاکانەوە لە سعودیە ژیاون، ئەوەیان بە چاوی خۆیان بینیوە کە چۆن نووسینگە تایبەتەکان ئاسانکاریان بۆ ئەو لاوانە پێشکەش دەکرد کە دەیانەویست بۆ جیهادی ئەفغانی بچن. زۆربەی قوتابیانی سعودی ئەو مۆڵەتەی خوێندنیان بۆ سەفەرکردن بۆ ئەفغانستان تەرخان دەکرد. ئەو خوێندکارانەش هیچ ڕێگرییەکیان لە چوونە ئەفغانستان نەدەدی، بلیتی سەفەرکردن بۆ ئەفغانستان هەرزانترین بلیتی سەفەربوو، هەندێك جاریش لەلایەن نووسینگە تایبەتەکانەوە پارە دەدرا، ئەو لێشاوە مرۆییەی سعودیە بۆ ئەفغانستان لەناو دەریای (پیشاوەر)ی دەکردەوە، کە پڕی بوو لە ڕەوتی ئیسلامی جۆراوجۆر.

سعودییەکان لە ئەفغانستان و پیشاوەر تاڕادەیەکی زۆر بێلایەن مانەوە، ئەگەرچی کەمێکیان دایانە پاڵ ئەم لاو ئەو لا، ئەمەش بەهۆی ڕۆڵی (ئوسامە بن لادن)، چونکە خودان داراییەکی زۆر بوو، توانی چەندین سەربازگەی مەشق و

ڕاهێنان و وانەی عەقائیدی لە ئەفغانستان بکاتەوە. بەردەوام ئامۆژگاری ئەوانەی دەکرد کە جەخت لەسەر جیهادی شیوعییە کافرەکان بکەنەوە و نەچنە ناو کێشمە-کێشمەکانی کۆمەڵی ئیسلامی میسری و مەغریبی[1].

بەڵام ئەگەر بپرسین بۆچی ئەفغانییەکانی سعودییە کە هەڵگری ڕەوتی سەلەفی میانڕەوی ئاشتیخواز بوون، وەرگەڕان بۆ ڕەوتێکی جیهادی شۆڕشگێڕی تەکفیری.

جێی خۆیەتی لێرەدا کەمێك بۆ مێژووی (ڕەوتی سەلەفی میانڕەوی) سعودی بگەڕێینەوە. ساڵی ١٧٤٤ ناوچەی نەجد هاوپەیمانیەتییەکی لە نێوان (الشیخ محمد بن عبدالوهاب و محمد بن سعود) بەخۆوە بینی کە بەڕێکەوتنی (الدرعیة) ناسرا، ئیدی کاروباری ئایینی و دونیا لە دەوڵەتی سعودی لە نێوان ئەم دووانە دابەشکرا.

١- هەر لەو کاتەوە هاوپەیمانێتی لە نێوان، ئەم دوو خانەوادەیە بەردەوام بوو، تاکو بزووتنەوەی ئیخوانی وەهابی (حرکة الاخوان الوهابیة) لە ساڵی ١٩١٢ دامەزرا، (الشیخ عبالکریم المغربی) سەرکردایەتی ئەو بزووتنەوەیەی گرتە دەست، دواتر ئەم بزووتنەوەیە بوو بە هێزێکی سەربازی. مەلیك عبدالعزیزی نەوەی محمد ئال سعود لە سەرەتاکانی دامەزراندنی دەوڵەتی سعودی هاوپەیمانێتی لەگەڵ وەهابییەکاندا کرد. وەهابییەکانیش کرۆکی سوپاکەیان پێکدێنا، بەمەش توانیان (نەجد) و(حیجاز) یەکخەن و ئەشرافی مەککە بۆ بیلادی شام و عیراق ڕاوەدوبنێن. سەرەتا مەلیك دەیویست دەوڵەتێك لەسەر بنەمای پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان دابمەزرێنێ بەڵام (وەهابییەکان) بەمە ڕازی نەبوون، چونکە پێیانوابوو ئەمە دەبێتە هۆی هاتنی ناموسوڵمان بۆ دوورگەی عەرەبی. دواتر مەلیك توانی بەسەر ئەمەدا زاڵ بێت کاتێ ڕووبەڕووی باڵی عەسکەری وەهابییەکان بووەوە و لە شەڕی (السلبە)ی ساڵی ١٩٢٩ بەسەریان سەرکەوت و توانی سەرکردەکەیان (سلطان بن بجاد) دەستگیر بکات.

---

[1] جریدة الشرق الاوسط، العدد ٩٢٩٢، سنة ٢٠٠٤.

سالّی ١٩٣٠ مەلیك (عبدالعزیز) لە ترسی هێزی وەهابییە ئیخوانەکان، نەوەکو دژی حکوومەتەکەی پیلان دابنێن، هەڵسا بەمەرسومێکی مەلەکی دەستەی (فرمانکردن بەچاکە و نەهی لە خراپ)ی بۆ دامەزراندن، بەمەش زۆربەیانی بۆ فەرمانبەری میری گۆڕی.

(٥٠) ساڵ دوای شەڕی (السلبە) واتە ساڵی ١٩٧٩ بزووتنەوەی (الجهیمان العتبی) کە درێژکراوەی ڕەوتی وەهابی توندڕەوە، پەیدابوو. ئەم بزووتنەوەیە بەسەرکردایەتی (الجهیمان العتبی) بوو، توانی (مسجد الحرام) لەبەرە بەرەی نوێژی بەیانی لە ٢٠ی نۆڤێمبەری ١٩٧٩ داگیربکات.

جهیمان ئەندامی پێشووی گاردی سعودی بوو. دەرچووی زانکۆی ئیسلامی شاری مەدینە بوو. دەست و پێوەندەکانی دوای ڕووداوەکە لەلایەن هێزەکانی سعودی و فەڕەنسی و ئوردونی کوژران و خۆشی دوایی تەسلیم بوو، زوو لەسێدارە درا[1].

ئێستا لەوە گەیشتین کە ڕەوتی سەلەفی توندڕەو هەر لە سەرەتای دامەزراندنی شانشینی عەرەبی سعودی، ڕەوتێکی ئامادەبوون لەناو هەناوی کۆمەڵگای سعودی، بەڵام سەردەمانێك لاواز و سەردەمانێکی دیکە بەهێز. دوای ڕووداوی (جهیمان)، داگیرکاری سۆڤیەت بۆ ئەفغانستان لە ساڵی ١٩٧٩ دەستی پێکرد. ئیدی ئەمجارەیان هەم دەوڵەت و هەمیش ڕەوتەکە ئاڕاستەی کارکردنیان یەکیگرتەوە، چونکە سعودیە یەکێتیی سۆڤیەتی وا دەبینی کە هەوڵ دەدات دەورەی وڵاتەکەی بدات. لە باشوورەوە یەمەنی باشوور کە ڕژێمی سۆسیالیستی فەرمانڕەوا بوو، لەلایەن سۆڤێتەوە یارمەتی دەدرا، هەروەها حەبەشە کە حکوومەتێکی عەسکەری چەپڕەوی هەبوو. سۆڤیەت لەکێشەی (ئوگادینۆ)

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٩٣٢، سنة ٢٠٠٣.

یارمەتی حەبەشەی دەدا، بۆیە سعودیە یارمەتییەکی زۆری ئەوانەی دەدا کە خواستی جیهادکردنیان لە ئەفغانستان هەبوو[1].

کەواتە ئەو وەرچەرخانە هەر لە دوای ساڵی ١٩٧٩ لە ڕەوتی سەلەفی جیهادی سعودیەوە دەست پێناکات، بەڵکو مێژوویەکیشی هەیە، بەڵام هەندێ پێیانوایە، ئەو وەرچەرخانە بۆ (ڕەوتی جیهادی شۆڕشگێڕی تەکفیری) بۆ سەرەتاکانی ساڵانی ١٩٩٠، بەتایبەتی دوای دووەم شەڕی کەنداو دەگەڕێتەوە، کاتێ (ابو محمد المقدسی) کە ئوردونیەکی بەڕەگەز فەلەستینیە، دوای ئەوەی ماوەیەك لە کوێت دەمێنێتەوە بۆ ئەفغانستان ڕادەکات.

(المقدسی) لە ماوەی مانەوەی لەکوێت، تێکەڵاوی (تیار اهل الحدیث الثوریین) کە میراتگری ئەو ڕەوتە بوو کە (الجهیمان) سەرکردایەتی دەکرد، ئەم ڕەوتەش ئەو دەم لەکوێت چالاك بوو. (المقدسی)ش لەناو ئەو ڕەوتە لە هەشتاکان چالاك بوو، بەڵام مقدسی لەگەڵ هەندێ لە سەرانی ئەم ڕەوتە کەوتە ناکۆکیەوە بەتایبەت کاتێ ئەوان زۆر جەختیان لەسەر مەسەلەی (التکفیر) دەکردەوە. (المقدسی) لەو ماوەیەدا چەندین نووسینی بڵاوکردەوە لەوانە کتێبی (ملة ابراهیم) کە کاریگەری لە کتێبی (معالم في الطریق)ی سید قطب کەمتر نەبوو، لەسەر ئایدیۆلۆژیای (جیهادی سەلەفی).

بیرۆکەی کتێبی (مله ابراهیم ) لەسەر ئایەتی ﴿قد كانت لكم اسوة حسنة في ابراهيم والذين معه اذ قالو لقومهم ان براءا منكم و مما تعبدون من دون الله كفرنا بكم وبدا بيننا وبينكم العداوة والبغضاء ابدا حتى تؤمنون بالله وحده...﴾ وەستاوە، ئایەتەکە هانی خەڵکی دەدات خۆی لەکوفر بێبەری بکات و لایەنگری خۆی بۆ خودا بەیان بکات. کوفریش بەڕای (المقدسی) چەندین شێوەی هەیە، لە

---

[1] التحالف والتخالف مع السلطة... التيار السلف السعودی، سیدی احمد بن سالم، المصدر جزيرة نت.

هەموویان گرنگتر فەرمان نەکردن بەوەی خودا ناردویەتی، هەروەك ئایەتی (ومن لم يحكم بما انزل الله فأولئك هم الكافرون) بەیانی کردووە. لەبەرئەوەی هەموو حکوومەتە عەرەبییەکان کار بەفرمانی خودا ناکەن، بۆیە ئەوانە (طاغوت)ن، تاغوتیش کوفرە. خوداش فرمانمان پێدەکات بێبەریبوونی خۆمان لە تاغوت و کوفر بەیان بکەین، هەروەك میللەتی ئیبراهیم کردوویانە، لێرەوەیە ناوی کتێبەکەی (المقدسی) بە (ملە ابراهيم) هاتووە.

(المقدسی) هەربەوە ناوەستێ تاغوت بەکوفر بناسێن، بەڵکو دەچێتە ناو وردەکارییەکانی کوفریشەوە، پێمان دەڵێ: (نابێ موسوڵمان خۆی لە کاروباری تاغوت وەربدات بەتایبەتی بواری سەربازی)، دواتریش (المقدسی) هێزە ئەمنییەکانی وڵاتانی عەرەبی بە کوفر ناوبرد.

(المقدسی) دوای داگیرکاری عێراق بۆ کوێت لە پیشاوەرەوە هاتەوە سعودیە، ئەمەش زۆری نەخایاند، بۆ ئوردون گەڕایەوە. لە دانپیانانەکانی ئەوانەی تەقینەوەکەی (ریاض)یان ساڵی ١٩٩٥ ئەنجامدا، دەرکەوتووە کە کتێبەکانی (المقدسی) لە ئوردونەوە بەلێشاو بۆ سعودیە تەهریب دەکران. دوای ئەوەی ناوبراو لە (پیشاوەر) بۆ ماوەی شەش مانگ مایەوە، لەم ماوەیەدا کتێبی (الكواشف الجلية في تكفير الدولة السعودية)ی نووسی. ئەم کتێبە بە چڕی دابەشکراو ژمارەیەکی زۆری بەنهێنی بۆ سعودیە ناردرا. ئەوانەی ئەوسەردەم لە پیشاوەر ژیاون دەزانن کە مزگەوتی مانگی سووری کوێتی شوێنی دابەشکردنی ئەم کتێبە بوو. ئەم کتێبە زیاتر لە سێ جار چاپکرایەوە. کورتەی ئەم کتێبە ئەوەیە کە ڕژێمی سعودیە ڕژێمێکی لە ئیسلام دەرچووە، چونکە فرمان بەیاسای دانراو دەکات و فرمان بەوەی خوا ناردویەتی ناکات. (المقدسی) توانای ئەوەی هەبوو کە ئەوە بسەلمێنێ ئەوەی حوکم بەوەی خوا ناردویەتی نەکات، تەکفیری بکات[1].

---

[1] الافغان العرب... اعداد محمد بن العاطى، المصدر جزيرة نت.

کتێبی (الكواشف الجيلة) له ترسناکترین ئەدەبیاتی ڕەوتی جیهادی سعودی بووە، چونکە له زەمینەی پیشاوەری ڕادیکاڵی ئیسلامی نووسراوە، که ئەمەش دواتر کاریگەری لەسەر بیری ئوسامە بن لادنیش دەبێ بەتایبەتی دوای گەڕانەوەی له سودانەوە بۆ ئەفغانستان.

له ڕاستیدا ئەو هاوتەریببوونەی ڕای حکوومەتی سعودی و ڕەوتی جیهادی سعودی ساڵی ١٩٩٤ کۆتایی هات، کاتێ ئەم ڕەوتە بینی سعودیە ئیدی ناتوانێ نوێنەرایەتی بیری ئیسلامی پاك بکات، له لایەکی دیکەوە ڕەوتی جیهادی سعودی ئەوەندە تەیارکرابوو بەبیری جیهادی و ڕادیکالیزمی ئیسلامی و تەکفیر، حکوومەتی سعودی نەیدەتوانی جڵەوی ئەو ڕەوتە بگرێتە دەست.

هەروەك له ژیانی ئوسامەدا باسمان کرد، له بەرەبەری کۆتایی شەڕی ئەفغان ئوسامە گەڕایەوە سعودیە، بەڵام جموجۆڵ و چالاکی لەژێر چادێریدا بوو. زۆری نەخایاند، هاتووچۆکانی ئوسامە له نێوان ئەفغانستان و سعودیە، دەسەڵاتدارانی هەراسانکرد. ئەوەبوو، ئوسامە لەژێر فشار سعودیە بەجێ دێڵێ و ساڵی ١٩٩٤ ڕوو له سودان دەکات. لەمەودوا نێوان ئوسامە و ئەفغانەکان و سعودیە بەرەو خراپی دەچێ، تا ئایاری ١٩٩٦ کاتێ لەژێر فشاری سعودیە و ئەمریکا ئوسامە ناچار دەبێ سودانیش بەجێ بێڵێ.

ئەو ئەفغانە سعودیانەی که پێشتر بەدەستخۆشی دەسەڵات بەرێکرابوون تاپێش ساڵی ١٩٩٤- ١٩٩٦ دەیانتوانی بەئازادی بگەڕێنەوە، بەڵام دوای بڵاوبوونەوەی فتواکانی شیخ (المقدسي) و ڕاگەیاندنی دژایەتی ئوسامە ئیدی نێوانی ئەفغانە سعودییەکان و دەوڵەتی سعودی بەتەواوی پچڕا.

هەندێ له ئەفغانە سعودییەکان دوای بەرپابوونی شەڕی براکوژی گروپە ئەفغانییەکان بۆ سعودیە گەڕانەوە، بەڵام دوای گەڕانەوەی ئوسامە له سودانەوە بۆ ئەفغانستان چوونەپاڵ بزووتنەوەی تالیبان. دووبارە کۆچی لاوە سعودیەکان بۆ ئەفغانستان دەستی پێکردەوە، بۆ ئەوەی بەشداری له دامەزراندنی (الامارة الاسلامية الافغانية) بەسەرکردایەتی مەلا محمد عمر بکەن.

ڕەوشی چالاکی و ڕێکخستنی ئوسامە و هاوکارەکەی زەواهیری لەژێر سایەی ئیمارەتی ئیسلامی بەرەو باشی چوو، دووبارە سەربازگەکانی ئوسامە بەکارکەوتنەوە. ئەو لاوانەی مەشقیان دەبینی ڕەوانەی وڵاتەکانیان دەکرانەوە بۆ ئەوەی بەشداری لە پرۆسەی دەرکردنی هێزە ئەمریکییەکان (مشرکین) لە دورگەی عەرەبی بکەن.

ساڵی ١٩٩٥ ئەفغانە سعودییەکان نووسینگەی قونسوڵگەری سەربازی ئەمریکیان لە ریاز تەقاندەوە، کە بووە هۆی کوژرانی (٥٠) ئەمریکی و (٢) هیندی وبریندار بوونی (٦٠) دیکە[1].

ساڵی ١٩٩٦ تەقینەوەکەی (الخبر)یان لە (ظهران)ئەنجامدا، (١٩) ئەمریکی کوژران و (٣٨٦) دیکەش بریندابوون کە (١٧)یان سعودی و (١١٨) بەنگالی و (١٠٩)یان ئەمریکی و (٤) میسری (٢)یان ئوردنی بوون.

ساڵی ٢٠٠١ ڕووداوە مێژوییەکەی ١١[2]ی سێپتێمبەر لە سەردەستی زۆرینەی ئەفغانە سعودییەکان ئەنجام درا، کە ئەم ڕووداوە بووە خاڵی وەرچەرخانی گەشەی دیاردەی ئەفغانە عەرەبەکان بەگشتی و پەیوەندی جیهانی ئیسلامی بە ئەمریکا بەتایبەتی.

دوای هێرشەکانی ئەمریکا بۆ سەر تالیبان، لە سعودیە ڕەوتێکی تازە سەریهەڵدا ئەویش ڕەوتی شێخانی جیهادی بوو. ئەم ڕەوتە کوێرانە لایەنگری تالیبان و قاعیدەیان دەکرد و فتوای شەڕکردنیان لەپاڵ تالیبان لەدژی بەرەی دژە تیرۆر کە سعودیە بەشێك بوو لێی، دەرکرد. دەرکەوتنی ڕەوتی (مشایخ الجهادیین) بەرەی لەژێر پێی شێخانی ڕابوونگەرایی کلاسیکی دەرهێنا، ئەم ڕەوتە دوای شەڕی ئەمریکا بۆ سەر عێراق چالاکیان زیاتر بوو، فتواکانیان زیادی کردووە، بوونە مەرجەعی لاوانی سعودی.

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٩٣٢، سنة ٢٠٠٣.

[2] الافغان العرب... محمد عبدالعاطی، هەمان سەرچاوە.

ساڵی ٢٠٠٣ کاتێ هێزەکانی ئەمریکا هاتنە ناو عیراق (شێخانی جیهادی) ئاڕاستەی ناردنی لاوانی سعودیان لە ئەفغانستانەوە بۆ ناو عیراق گۆڕی، بەمەش ژمارەیەکی زۆری لاوانی سعودی بۆ عێراق دەهاتن و لە کردەوە تیرۆرستییەکان و خۆکوژییەکان بەشداریان دەکرد.

ساڵی ٢٠٠٥ شانشینی عەرەبی سعودی لیستێکی (٣٦) کەسی، ئەوانەی لەلایەن دادگای سعودی بەتۆمەتی پەیوەندی بەقاعیدە و کردەوەی تیرۆرستی تۆمەتبار کراون، بڵاوکردەوە. لەم لیستەدا ناوی ئەو ئوسوڵیانەی کە لە بواری چەکداری بەناوبانگن هاتبوو وەك (یوسف العییری، عەبدوڵڵا الرشود، عیسی العوشن، فارس آل شوین).

یونس الحیاری مەغریبی کە ناوی ڕاستەقینەی (یونس محمد ابراهیم الحیاری، ٣٦ساڵ)ە، ئەم پیاوە هەروەك بەیانی وەزارەتی ناوەخۆی سعودی باسی کردووە، ساڵی ٢٠٠١ لە مەراسیمی حەج دا هاتۆتە سعودیە، دەزگا ئەمنییەکانی سعودی (الحیاری) بەسەرکردەی قاعیدە لە سعودیە دەزانن، چونکە شارەزاییەکی زۆری سەربازی لەکاتی شەڕەکانی بۆسنە و هەرسك دەستکەتووە.

هەروەها مەغریبەکی دیکە بەناوی (کریم المجاطی) لەو لیستەی سعودیە ناوی هاتووە، المجاطی خاوەنی پەیوەندیەکی فراوان بوو لەگەڵ ڕێکخستنی قاعیدە[١].

ساڵی ٢٠٠٤ (ڕێکخستنی قاعیدە لە دوورگەی عەرەب) بڵاویکردەوە کە چەکدارانی ڕێکخستنەکەی ئیتاڵییەك و سویدییەکیان سەربڕیوە، ئەمەش لەسەر زاری کەسێکی سەر بەقاعیدە بەناوی (عیدالعزیز المقرن) ناسراو بە (ابو هاجر) هاتووە. (المقرن) یەکێکە لەوانەی حکوومەتی سعودی داوای دەکات و تۆمەتبارە بەچەندین کردەوەی تیرۆرستی لە سعودیە[٢].

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٩٣٢، سنة ٢٠٠٣.

[2] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٩٧١٠، سنة ٢٠٠٥.

سعودیە یەکێك بوو لەو وڵاتانەی جیهادی ئەفغانی موبارەك کرد، بەڵام ئەفغانی سعودی بۆخۆی دروستکرد و دواتر جەنگاورانی سعودی لە عێراق بەمەش سعودیە لە وڵاتێکی هاوردەی تیرۆر بووە وڵاتێکی گرفتار بەدەستی تیرۆر.

## ئەفغانە عەرەبەکان و چالاکی نواندن لە سودان

لە ڕاستیدا ئەفغانە عەرەبەکان دوای ئەوەی لەلایەن سەرۆکی سودانی (عمر حسن احمد البشیر) و سەرۆکی ڕۆحی سودان (دکتور حسن الترابی) ساڵی ١٩٩٠ ڕێگەیان پێدرا بەبێ ڤیزا بێنە ناو سودان، ئەوان بەلێشاو ڕوویان لەم وڵاتە کرد[١].
ساڵی ١٩٩٢ ئوسامە بن لادن دوای کەوتنی کابوڵ لە ساڵی ١٩٩٠ بە دەستی مەجاهیدان گەیشتە سودان و چاوی بە دکتۆر حسن الترابی کەوت و لەو سەردانەیدا چەندین عەرەبی ئەفغانی لەگەڵ دابوو، لەوانە (ئەیمەن زەواهیری و ابو حفص المصری و مصطفی حمزة)[٢].

چالاکییەکانی ئەفغانە عەرەبەکان لە مانەوەیان لە سودان دوو لایەنی سەرەکی لەخۆدەگرێ:

یەکەم: چالاکی وەبەرهێنان هەروەك لە ژیانی ئوسامەدا باسمانکرد، کاتێ ئوسامە لە سعودیە بەرەو سودان چوو، هێشتا پارەوپولەکانی لە سعودیە دەستیان بەسەرا نەگیرابوو، بۆیە دەیتوانی چالاکی بازرگانی و پڕۆژەی جۆراوجۆر ئەنجام بدات، لە سودانیش بەشداریکرد لە بونیادنانەوەی ژێرخانی ئابووریی سودان، دەستی بەدروستکردنی بەستی (روسیرس)کە لە گەورەترین بەستەکانی

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٩٣١٦، سنة ٢٠٠٤.

[2] الافغان العرب – اعداد: محمد عبدالعاطي – المصدر جزيرة نت.

سودان بوو،کرد. هەروەها ڕێگای (التحدی) کە ڕێگایەکی سەرەکییە کە شارەکانی (خرطوم — شندی - عطبرة) بەیەکەوە دەبەستێتەوە، دروستکرد.سەرباری کردنەوەی دەروازەی نێوان شاری (کنانە - الرهد) و دروستکردنی فرۆکەخانەی پۆرسودان، هەندێ پێیانوایە سەرمایەی ئەوسای بن لادن لە سودان خۆی لە (٥٠) ملیۆن دۆلار دەدا[1].

دووەم: چالاکی ڕێکخستن: ئوسامە لە سودان دوو سەربازگەی یەکێکیان بۆ(جیهاد) و ئەوەی دیکەیان بۆ (الجماعة الاسلامیة)ی میسری دروستکرد، ئەمەش لەبەر ئەو ڕۆڵە گەورەیەی هەردوو کۆمەڵە ئیسلامییەکە بینیویانە لە پاڵپشتی کردنی ئوسامە بن لادن، حکوومەتی میسریش بوونی ئەم دوو سەربازگەیەی پشت ڕاست کردۆتەوە.

ئەم پاڵپشتیەی سودان لە ئەفغانە عەرەبەکان، حکوومەتی سوودانی تووشی دەردەسەرییەکی زۆرکرد، دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت ئەفغانە عەرەبەکان خاکی سودان بۆ هێرشکردنە سەر میسر و جەزائیر بەکاردێنن و لەوێوە تیرۆر بۆ ئەو وڵاتانە دەنێرن، زۆربەی ئەوانەی لە ئەفغانستان گەڕاونەتەوە، ئوسامە بەنهێنی خەرجی گەڕانەوەی ئەوانی لە ڕێگەی سودانەوە بۆ میسر و جەزائیر زامن کردووە.

مستەفا حمزە لە ماوەی مانەوەی لە سودان سودی لەوە وەرگرت پیلانێك بۆ تیرۆرکردنی سەرۆکی میسری (حوسنی موبارەك) دابڕێژێ، ئەم پیلانە کە لە یونیوی ١٩٩٥ لە ئەدیس ئەبابا دژ بە سەرۆکی میسری کرا، سەرکەوتوونەبوو، ئەمەش بووە هۆی تێکچوونی پەیوەندەی نێوان میسر و سودان و سەپاندنی سزا لەلایەن ئەنجوومەنی ئاسایشەوە بەسەر سودان، دوای ئەمە سودان بڕیاری دا ئەفغانە عەرەبەکان لەسەر خاکی خۆی دەربکات.

---

[1] الافغان العرب محاولة للتعريف، د. نشأت حامد عبدالماجد، اسلام اون لاين.

هەرچەندە ئوسامە و هاوەڵانی بە فرۆکەیەك لە جۆری C130 لە ١٨ی مایۆی ساڵی ١٩٩٦ بەرەو ئەفغانستان گەڕانەوە، بەڵام پەیوەندی حکوومەتی سودان بە ڕێکخراوی قاعیدە هەر بەردەوام بوو[1].

ساڵی ١٩٩٨ سودان ڕووبەڕووی هێرشی ئاسمانی ئەمریکی بووەوە، دوای ئەوەی هەردوو باڵیۆزخانەی ئەمریکی لەنایرۆبی و دار السلام لەلایەن قاعیدەوە تەقێنرایەوە.

نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێ کە سودان نەوەك هەر بۆ (میسر و جەزائیر)، بەڵکو بۆ وڵاتانی دیکەی وەك (سۆماڵ و کینیا و تەنزانیا) پێگەیەکی بەپیتی ئەفغانە عەرەبەکان بوو، ئەوەتا لایەنە سۆماڵییەکان سودان بەوە تاوانبار دەکەن کە ڕێگەی داوە، ئەفغانە عەرەبەکانی هانداوە بۆناو سۆماڵ دزەبکەن، زۆربەیان چوونەتە ناو (بزووتنەوەی یەکگرتووی ئیسلامی)، شایەنی باسە ناوچەی کیشوەری ئەفریقی زەمینەیەکی گرنگە بۆ ئەفغانە عەرەبەکان دوای ئەوەی لە زۆرێك لە وڵاتانی عەرەبی چالاکییان بەرتەسك کرایەوە، خنکانی (ابو عبیدە البنشیری) سەرکردەی ڕێکخستنی سەربازی قاعیدە ساڵی ١٩٩٦ لە دەریای (ڤیکتۆریا)، ئەوەی بەدونیا ڕاگەیاند کە ئەفغانە عەرەبەکان لە کیشوەری ئەفریقیا هەن. هەروەها ئاشکرا بوونی ناسنامەی ئەوانەی لە تەقینەوەکەی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە (کینیا و تەنزانیا) ساڵی ١٩٩٨، دووبارە جەختکردنەوەیە لەسەر چالاکی ئەفغانە عەرەبەکان لەو دەڤەرە.

هەندێ سەرچاوە باس لەوە دەکەن کە کۆمەڵێ ئەفغانی عەرەب، چاودێری ئەو هێزە ئەمریکیانەیان کردووە کە لە چوارچێوەی پرۆسەی (گێڕانەوەی هیوا) کە ساڵی ١٩٩٤ هاتبوونە سۆماڵ. ئەوانە بەهاوکاری کۆمەڵی (محمد فارح عیدید) بەشداریان لە چەندین چالاکی دژ بە هێزەکانی ئەمریکی کردووە، کە لە ئەنجامدا

---

[1] هەمان سەرچاوە.

٢٠ سەربازی ئەمریکی کوژران، ئەمەش وایکرد هێزە ئەمریکییەکان سۆماڵ جێ بهێڵن.

ساڵی ٢٠٠١ پەیوەندی نێوان (عمر حسن البشیر) و (دکتۆر حسن الترابی) تێکدەچێ، تورابی کە زیاتر مەیلی ئەفغانە عەرەبەکانی هەبوو، بەشیر لە پیلانەکانی تورابی کەوتە گومانەوە، بۆیە لە ژێرچاودێری بەزۆرەملێی دانا. بەشیر بەنهێنی پەیوەندی بە ئیدارەی سەرۆکی ئەمریکی (بیل کلنتۆن)ەوە کردو تەسلیم کردنەوەی بن لادنی خستە بەردەم ئەمریکییەکان، بەڵام ئەم پێشنیارەی بەشیر گرنگی پێنەدرا (دوای ڕووداوەکانی ١١ی سێپتێمبەر کلنتۆن دانی بەوە دانا کە ڕەتکردنەوەی پیشنیارەکەی بەشیر گەورەترین هەڵە بووە).

بەشیر بەپێچەوانەی ئاراستەی (با) ویستی هاوکاری لەگەڵ ئیدارەی ئەمریکی بکات، بەتایبەتی دوای ڕووداوەکانی ١١ی سێپتێمبەر.

لەئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠١ بەشیر چەندین زانیاری بەنرخی لە بارەی قاعیدە دایە دەزگای هەواڵگری ئەمریکی و ئەورووپی، بەڵام ئەو مەترسیەی کە ئیسلامییەکانی سودان دروستیان دەکرد، لە ناونەچوو. لە دانپیانانەکانی ئەوانەی هەردوو باڵیۆزخانەکانی ئەمریکیان لە (نایرۆبی و دارالسلام) تەقاندەوە، زۆر زانیاری لەسەر ڕۆڵی سودان بەدەرکەوتن.

کاتێك بارەگا سەرەکییەکانی قاعیدە لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٠ بۆ سودان گواسترانەوە، ئوسامە بن لادن بەگەرمی پێشوازی کراو لەلایەن ڕژێمی سودانەوە پەسەندکرا، هەر لە سودان قاعیدە تۆڕی دارایی و تیرۆرستی خۆی فراوان کرد، هەرچەندە پەیوەندیی ئوسامە بە دامەزراوە سیاسییەکانی سودان ئەوەندە لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکرابوو، قاعیدە بۆ ئەوەی دەسەڵات لە سودان فراوان بکات بۆ ناو ریزەکانی دەزگای ئاسایشی سودانی لە ڕێگەی حزبی ئیسلامییەوە، دزەی کرد. هەوڵێشیدا دەست لەناو چەند وەزارەتێك (وەك ئاسایش و ناوەخۆ و وەزارەتی بەرگری و وەزارەتی کاروباری دەرەوە و فەرماندەیی سوپا) وەربدات، بۆ

نمونه (جمال فەزلی) ئەندامی قاعیدە بۆ ماوەیەك بۆ بەرژەوەندییەكانی دەزگای نەهێشتنی سیخوڕی و هەواڵگری نێوخۆ و دەزگای ئاسایشی شۆڕش كاریكردوە، سەرباری ئەوەی ناوبراو توانی چەندین بنكەی مەشق و ڕاهێنان لە سودان بكاتەوە.

لە ژێر سایەی ئەو چاودێرییە فەرمییەی قاعیدە لە سودان هەیبوو، قاعیدە توانی توێژینەوە لەسەر چەكی كیمیاوی و بایۆلۆژی و ناوەكی بكات، هەروەها توانی ئیدارەی كڕینی چەك لە سودان بكات. قاعیدە لەم توێژینەوانەدا بنكەی (كوكو)ی سەربازی بۆ تاقیكردنەوەی ئەو قوتوە یۆرانیۆمانەی كە بە بەهای ١،٥ ملیۆن دۆلار لە باشووری ئەفریقیا كڕیبوو، بەكاربهێنێت. ساڵی ١٩٩٤ (جمال فەزل) ئەو قوتووانەی لە ڕێگەی بەرپرسێكی پایە بەرزی سودانی (كە بەخشیشەكەی ١٠ هەزار دۆلار بوو) بە دەست كەوت. لە بنكەی (كوكو) ئەو چەكانەی قاعیدە تاقیدەكرانەوە. سەرچاوە ڕۆژئاواییەكان باس لەوە دەكەن كە قاعیدە ماددەیەكی نوێی دروست كردووە ناوی ناوە (بۆمبی پیس) كە موجاهیدانی چیچانی لە یەكێ لە باخچەكانی مۆسكۆ دایانناوەتەوە، ئەو بۆمبە تیشكی زیانبەخش دەردەكات. ئوسامە بن لادن ڕازیبووە لەسەر ئەوەی كە تاقیكردنەوە لەسەر ژەهری خێرا بلاوبووەوە بكرێت، وەك ژەهری (ریسین و هۆبرۆتینی سپی) كە لەو ژەهرانەن لەناو یەكێك لە پەرتوكەكانی قاعیدە باسكراوە، قاعیدە سودانی وەك خاكی پەڕینەوەی ئەو چەكانەی كە لە مافیاو چەتەكانی ڕوسیا و ئۆكرانیا دەكڕێ، بەكار دێنا و بۆ ئێران و ئەوگروپانەی كە سەر بەون دەنارد.

بۆ نمونە ساڵی ١٩٩٣ (حبیب پاكستانی) و (ابو محمد الیمنی) ئەو بارە چەكەی كە لە تۆپی دوور هاوێژی میكانیكی پێكهاتبوو لە پۆرسودانەوە بۆ بزووتنەوەی (سیف الاسلام)ی لە باشووری سەنعا نارد، بۆ ئەوەی لە هێزە ئەمریكییەكان بدەن.گرنگی سودان وەك پێگەیەك بۆ گوزەركردنی چەك بۆ قاعیدە لە ساڵی

١٩٩٦ كۆتایی هات، دوای ئەوەی ڕێکخراوی قاعیدە بۆ ئەفغانستان گەڕایەوە، بەڵام قاعیدە چەند کەشتییەکی بۆ گواستنەوەی چەك بۆ گروپەکانی سەربەخۆی کڕی و فرۆکەخانەی (کراتشی) بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێنا.

سودان لە ژێر ئاڵای ئیسلام یارمەتی ئیسلامییەکانی (کینیا و ئۆگەندا و تەنزانیا و سۆماڵ و ئەسیوپیا)ی دەدا، ساڵی ١٩٩٥ بە یارمەتی ئێران بەرەی ئیسلامی نیشتیمانی و ڕێکخراوی قاعیدە توانیان (٢٣) بنکەی مەشقکردن لە سودان بکەنەوە، ئەگەرچی دوای ڕۆیشتنی بن لادن بۆ ئەفغانستان زۆربەیان هەڵوەشانەوە،کەچی ئیسلامییەکانی سودان (١٢)یان هێشتەوە بۆ ئەوەی وەك بنکەی ئاراستەکردنی ئایدیۆلۆژی بەکاربهێنرێن، ئیسلامییەکانی هەمەجۆر ڕەگەز ڕوویان لەم بنکانە دەکرد، ئەم بنکانەش تا دەستگیرکردنی تورابی ئەوکەسەبوو توانی (٤٠) پارتی سیاسی ئیسلامی لەژێر پەرچەمی (کۆنگرەی عەرەبی ئیسلامی میللی) کۆبکاتەوە، نوێنەرانی ئەو پارتانە بە ڕۆژ بۆ چۆنیەتی یەکگرتنیان کۆدەبوونەوە، بەشەویش باسیان لەو ڕێوشوێنانە دەکرد کە بەهۆیەوە بتوانن گورز لە ئەمریکا بوەشێنن، ئوسامە بن لادن کە خەرجی ئەو کۆبوونەوانەی لە ئەستۆ گرتبوو، لە هەندێ لەو کۆبوونەوانە بەشداردەبوو، دەزگای هەواڵگری ڕۆژئاوا وێنەی بن لادنی لەکاتی ئەو کۆبوونەوانە گرتووە، کە لەگەڵ نوێنەرانی پارتە ئیسلامییەکان ئەنجامیداوە[1].

## ئەفغانە عەرەبەکان و توندوتیژی سیاسی لە یەمەن:

سەرەتاکانی سەرهەڵدانی چالاکی ئەفغانە یەمەنییەکان لە یەمەن بۆ نێوان ساڵانی ١٩٨٨-١٩٨٩ دەگەڕێتەوە، کاتێ ئەو پلانەی (ئوسامە بن لادن) ئاشکرابوو، کە دەیویست لە باشووری یەمەن جێبەجێی بکات، پێش ئەوەی

---

[1] القاعدة من الداخل، تأليف روهان جوناراتانا.

هەردوو یەمەنەکە (کۆماری یەمەنی دیموکراتی لە باشوور بە سەرۆکایەتی علی سالم بیض لەگەڵ کۆماری یەمەن بە سەرۆکایەتی علی عەبدوڵڵا صالح) ساڵی ١٩٩٠ یەکبگرنەوە، ئەو پیلانەی ئوسامە بن لادن ساڵی١٩٨٩ ئاشکرابوو، کاتێك ویستی کردەی جیهادی سەربازی و دامەزراندنی بزووتنەوەیەك یان ڕێکخستنێك لە باشووری یەمەن (یەمەنی ئیشتیراکی) بەڕێبخات[1]. نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێ کە خۆیەخشە یەمەنییەکانی باشوور، سەربازگەی تایبەت بەخۆیان لە ئەفغانستان هەبوو. لە نێوان ئەمانەشدا سەرکردەی وەك (طارق الفضلي) هەبوو[2]، ئەمانە لە نێوخۆیان باسیان لە گواستنەوەی جیهاد بۆ ئەو بەشە شیوعییەی یەمەن دەکرد، کەواتە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی دژ بە سۆڤیەت، ئەو ئەفغانە یەمەنیانەی مەشق و ڕاهێنانی باشی چەکیان بینیبوو، دەیانویست بگەڕێنەوە یەمەن و چالاکی سەربازی (چەکداری) دژ بە حکوومەتی یەمەنی باشوور ئەنجامبدەن، بەڵام ئەم خواستەی ئەفغانە یەمەنییە باشوورییەکان هێندەی نەبرد لەگەڵ خواستی دەسەڵاتی یەمەنی باکوور یەکیگرتەوە کاتێك ژمارەیەکی زۆر لە ئەفغانەکان ساڵی ١٩٩٤ بەشدارییان لە شەڕی نێوان هەردوو یەمەن کردو چوونە پاڵ یەمەنی باکوور لە دژی حکوومەتی یەمەنی باشوور.

ئەگەر سەیری ڕووداوە سیاسییەکانیٰ یەمەن ساڵی ١٩٨٩ تاکو ساڵی ٢٠٠٢ بکەین، دەبینین کە ئاراستەکان بەرەو ئەوە دەچن کە چالاکی سیاسی و ڕێکخراوەیی و چەکداریی ئەفغانە عەرەبەکان ڕوو لە زیادی دەکەن.

ساڵی ١٩٨٩ ئەفغانە عەرەبەکان پەیتا پەیتا بەو فیکرە جیهادییەی کە لە ئەفغانستان وەریانگرتبوو بۆ یەمەن دەگەڕانەوە، ساڵی ١٩٩٠ یەکگرتن لە نێوان هەردوو یەمەن ڕوویدا، بەڵام ئەفغانە عەرەبەکان بە چاوی دوژمن سەیری ڕژێمی سیاسیی باشووریان دەکرد، لە بەرئەوەی سیستەمی سۆسیالیستی بە پاڵپشتی

---

[1] هەمان سەرچاوە

[2] جريدة الشرق الاوسط، عدد ٨٨١٧، سنة ٢٠٠٣.

سۆڤیەت لە وڵاتەکە پیادەکرد، (الشیخ عبدالمجید الزندانی) کە ناوە ناوە سەردانی پیشاوەری کردبوو، دواتر بووە سەرۆکی (التجمع الیمنی للاصلاح المعارض)کە کاریگەری زۆری لەسەر ئەفغانە عەرەبەکان هەبوو، داوای لێکردن بیرۆکەی دوژمنداری و جیهاد لە یەمەنی باشوور دوا بخەن و چاوەڕێی ئەو کرانەوە سیاسییەی یەمەن، بەتایبەت دوای یەکگرتنی نێوان هەردوو یەمەن ساڵی ۱۹۹۰ ڕوویدا، بکەن[1].

تا ساڵی ۱۹۹۳ زۆرینەی هەرە زۆری ئەفغانە عەرەبەکان بۆ یەمەن گەڕانەوە، گەڕانەوەی هەندێکیان هەر لەسەرەتاوە بەرنامەی بۆ داڕێژرابوو، پەیوەندیداربوو بە پلانەکانی قاعیدە و ئەو لق و پۆپانەی کە قاعیدە بە نیاز بوو لە یەمەن بیانکاتەوە. لە ڕاستیدا لە نێوان ساڵانی ۱۹۹۰-۱۹۹۲ زەمینەیەکی لەبار بۆ قاعیدە هاتە پێش بۆ ئەوەی لە ناوچە دوورەدەستەکانی یەمەن دوور لە دەستی دەسەڵاتداران، لە ناوچە چیاییەکان، ڕێکخراو و کۆبوونەوە و مەشق بە ڕێکخستنەکانی بکات.

ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو یەکگرتنەی نێوان هەردوو یەمەن بەرەو هەڵوەشانەوە دەچوو، ڕۆژ بە ڕۆژیش ڕێکخراوی قاعیدە و ئەفغانە یەمەنییەکان چالاکتر دەبوون، ساڵی ۱۹۹۲ ئەفغانە عەرەبەکان لە یەمەن بە تەواوی خۆیان ڕێکخست، لە سەری ساڵی ۱۹۹۳ چەند تەقینەوەکیان لە هۆتێلەکانی عەدەن و هەندێ دامەزراوە لە (ابین) ئەنجامدا، هەر ئەو ساڵەش بوو کە کێشەی نێوان هەردوو یەمەنەکە گەورەبوو، ئەو جیاوازی و ململانێیانەی کە لە نێوان هەردوولادا هەبوو، ئیتر نەشاردرایەوە.

ساڵی ۱۹۹۳ ناکۆکییەکانی نێوان هەردوو یەمەن ئەوەندە زۆر بوون، شێوەی پیلانگێڕی و ڕەخنەی سیاسی و جەمسەرگیری لە خۆگرت، هەندێ پارتی سیاسی هەڵوێستیان یەکخست، ئەم پەشێوی و سەرگەردانییە، ڕێگەی لە بەردەم ئەفغانە

---

[1] الافغان العرب محاولة للتعریف، د. نشأت حامد عبدالماجد.

عەرەبەکان زیاتر ئاوەڵا کرد، کە بەئازادانە چالاکییەکان برەوپێبدەن و پەیوەندی فراوان لەگەڵ ئەفغانەکانی دیکەی وڵات گرێبدەن و مەشق و زانیاری ئاڵوگۆڕ بکەن، تا وای لێهات باشووری یەمەن بە ئاشکرا چالاکی چەکداری و تەقینەوەی لەلایەن ئەفغانە یەمەنییەکانەوە، تێدا ئەنجامدەدرا.

هەر لەو ساڵەدا (١٩٩٣) قاعیدە چەند تەقینەوەیەکی ئەنجامداو هەوڵی تیرۆکردنی چەند کەسایەتییەکی سیاسیان داو چەند جارێکیش لەگەڵ هێزەکانی ئاسایش ڕووبەڕوو بوونەوە، هەروەك ئەوەی لە پارێزگای (لحج) ڕوویدا، بەمەش زیاتر خۆی لە گۆڕەپانی سیاسی یەمەنی وەك هێزێك کە دەیەوێت دژایەتی ئەو فیکر و مەیل و پارتانە بکات کە سەربە شیوعیەت و دژی ئیسلامن، ناساند.

ساڵی ١٩٩٤ ناکۆکییەکانی نێوان هەردوو یەمەن، گەیشتە ڕادەیەکی وا، کە چیتر نەدەکرا، ئەو دوو یەمەنە بە یەکەوە هەڵبکەن، ئەوە بوو شەڕ لە نێوان هەردوولا ڕوویدا، یەمەنی باشوور جیابوونەوەی خۆی لە یەمەنی باکوور ڕاگەیاند، ئیدی شەڕی نێوخۆ لە یەمەن ڕوویدا، ئەفغانە یەمەنییەکان دەرگایان بۆ کرایەوە، بۆ ئەوەی بەئاشکرا کاربکەن، لەم شەڕەدا ئەفغانە عەرەبەکان بێ لایەنگری نەمانەوە، بەلکو دایانەپاڵ یەمەنی باکوور و حکوومەت لە دژی پارتی ئیشتیراکی (یەمەنی باشوور)، تا شەڕ کۆتایی هات، بەمەش ئەفغانە عەرەبەکان توانیان جێ پێی خۆیان لە یەمەن بکەنەوە و لە دەستکەوتەکانی سەرکەوتنی شەڕ پشکیان هەبێ، هەلیان پێدرا لە چەند پارێزگایەك وەك (عەدەن) و دەوروبەری شوێنی تایبەتیان هەبێ، بەڵام ئەمەش زۆری نەخایاند.

هەردوای مانگێك لە شەکراوی سەرکەوتنی ئەفغانە عەرەبەکان و حکوومەتی باکوور بەسەر حکوومەتی باشووردا، ئەفغانە یەمەنییەکان دەستیاندایە هەندێ جموجۆڵ و کردەوە کە خەڵکی عەدەنیان بێزارکرد، خۆیان بە بەدیلی حکوومەت لە عەدەن دەزانی و دەستیان بەسەر برێکی زۆر لە چەك و تەقەمەنیدا گرت و بنکەکانی هێزە عەسکەرییەکانیان کردە بارەگای خۆیان، حکوومەت بەم کارەی

ئەفغانە یەمەنییەکان ئیستفزاز بوو، سەرەتا حکوومەت ویستی بە ئاشتیانە ئەو بارەگایانە وەربگرێتەوە، بەڵام ڕووبەڕووی شەڕی کۆڵانان بووەوە، حکوومەتیش ڕێگای نێوان (عدەن - ابین)ی بەتانك و زرێپۆش داخست و ڕایگەیاند هەموویان لەناودەبرێن ئەگەر لەسەر ئەو هەڵوێستەیان بەردەوام بن، بەم شێوەیە حکوومەت توانی سنوورێك بۆ ئەو کۆمەڵانە دابنێ کە بەناوی (جیهاد)ەوە کاریان دەکرد، ئەو کۆمەڵانە دووبارە دەستیان دایەوە کاری نهێنی، حکوومەتیش لەمەودوا چالاکی ئەو گروپانەی بەوردی خستە ژێر چاودێرییەوە.

ئەم هەڵوێستەی حکوومەت، وای لە ئەفغانە یەمەنییەکان کرد، کە بەستراتیژیەتیاندا بچنەوە و سیاسەتی خۆیان لە بەرانبەر ئەو حکوومەتەدا بگۆڕن کە لە شەڕی نێوەخۆدا یارمەتیانداوە، ئەوەبوو ڕایانگەیاند ڕووبەڕووی ئەو حکوومەتەش ببنەوە و هەموو ڕێگایەك بۆ دژایەتیکردنی بگرنەبەر، هەر لەسەر ئەم هەڵوێستە لە دژایەتیکردنی حکوومەتی یەمەنی بەردەوام بوون.

ساڵی ١٩٩٤ بەدواوە ئەفغانە یەمەنییەکان لە ڕێگەی (منظمة الجهاد الاسلامي) بە سەرۆکایەتی (الشیخ طارق الفضلي) دەستیان دایە چەند کارێکی توندوتیژی کە هەندێ (دامەزراوی گەشتیاری) وەك ئەو هوتێلەی کە لەلایەن ئەو سەربازە ئەمریکیانەی کە لە چوارچێوەی پرۆسەی گێڕانەوەی هیوا (اعادة الامل) لە باشووری سۆماڵ کاریان دەکرد، تەقاندەوە، هەروەها چەند کەسایەتییەکی ناسراوی پارتی سۆسیالیستی یەمەنییان تیرۆرکرد، بەتایبەت ئەوانەی لایەنگیریان بۆ دەست تێوەردانی سۆڤیەتی لە ئەفغانستان ڕاگەیاند بوو.

ماوەی ساڵانی نێوان ١٩٩٥-١٩٩٨ شایەتی چەند چالاکییەکی ئەو کۆمەڵانە بوو، کە پێدەچوو لەو ماوەیەدا زۆر بەنهێنی کاریان کردبێ، دەزگا ئەمنییەکانی یەمەنیش توانیان هەندێ لە ئەندامانی ئەو گروپانە دەستگیر بکەن، لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٩٨دا قۆناغێکی نوێ لە چالاکی ئەو گروپانە دەستیپێکرد، چونکە ئەو ئەفغانە یەمەنیانە بۆ یەکەمجار خۆیان لە چوارچێوەی ڕێکخستنی

(سوپای عەدەن) ئاشکراکرد، ئەو ڕێکخستنە نوێیەش کە زۆربەی هەرە زۆری ئەفغانە عەرەبەکانی لە خۆگرتبوو، لەبەیانێکدا دامەزراندنی خۆیان بەئیمزای سەرۆکەکەیان (ابو الحسن المحضار) ڕاگەیاند.

سوپای (عدن ابین) پشتگیری خۆی بۆ ئوسامە بن لادن دووپاتکردەوە، بەتایبەتی کاتێ ئەمریکا گورزی سەربازی لە سودان و ئەفغانستان وەشاند.

لەیەکەم بەیانی (سوپای عەدەن) هاتبوو کە ڕێکخراوێکی جیهادیە و ئامانجی جێبەجێکردنی شەرعی خودایە لەسەر زەوی و دامەزراندنی ڕژێمێکە کە کار بە شەریعەتی خودا بکات، هەروەها بە ئامانجی شەڕکردن لە دژی فەسادی و ئەو ڕژێمە ناموسوڵمانەی کە حوکمی یەمەن دەکات، لەو لاوە موجاهیدانەی کە باوەڕیان بە خوداو پێغەمبەر و جیهادکردن لەپێناو جێبەجێکردنی شەرعی خودا لەسەر زەوی هەیە، پێکهاتووە.

جەیشی عەدەن لەبەیاننامەی دووەمدا،کە بە شێوەیەکی نهێنی بڵاوکرایەوە، داوای لە هەموو ئەوانە کرد کە هاوبیری ڕێبازی ڕێکخراوەکەن، بێنەپاڵ سوپای عەدەن، ئەم داوایە ئەندامانی سوپاشی دەگرتەوە، هەروەها لەبەیانەکەدا هاتبوو کە ئەوانەی هەوڵ دەدەن ڕووبەڕووی سوپاکە ببنەوە، بەدوژمن دادەنرێت و شەڕکردنی واجب دەبێ، بەیانەکە هانی هەموولایەکی دەدا بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی یەمەنی.

ڕفاندنی ئەو (١٦) گەشتیارە ئەوروپییەی پارێزگای (ابین) ١٩٩٨/١٠/٢٨ کە ئەندامانی ڕێکخراوی (جیش عدن) ئەنجامیاندا، خودی سەرکردەی ڕێکخراوەکە (ابو الحسن المحضار) بەشداری تێداکرد، ئەوەی سەلماند کە ئەو ڕێکخراوە بەڕاستی بوونی هەیە و توانایەکی فراوانی چالاکی نواندنی لە یەمەن هەیە[1].

لە بەرئەوەی ئەو چالاکی ڕفاندنە مۆرکێکی سیاسی هەبوو، جیابوو لەو چالاکی ڕفاندنانەی کە لە یەمەن ڕوویدەدا و کە زۆربەی جار بەمەبەستی دەستکەوتنی

---

[1] هەمان سەرچاوە.

چەند ئیمتیازێك بۆ هۆزێك ئەنجام دەدران، بەڵام لە مەیاندا مەسەلەکە تەواو جیابوو بۆیە حکوومەتی یەمەنی بەهێز ڕووبەڕووی کێشەکە بووەوە و کۆتایی بە پرۆسەی ڕفاندنەکە هێنا، ئەگەرچی ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداریش لەگەڵ ڕفێنەران ڕوویدا و لەئەنجامدا (٤) کەس لەگەشتیاران و ئەندامێکی گروپەکە کە ڕەگەزنامەی وڵاتێکی عەرەبی هەڵگرتبوو، کوژران و سەرۆکی (جیش عدن) و ژمارەیەك لەدوا کەوتوانی دەستگیرکران، (ابو الحسن المحضار)ی سەرۆکی کردەکە کە فرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو، هەر ئەو ساڵەش فرمانەکە جێبەجێکرا.

١٩٩٨/١٠/٢٣، واتە هاوکات لەگەڵ ئەو کردەی ڕفاندنە، هێزەکانی ئاسایشی یەمەنی لە پارێزگای (شبوة) ١٠ کەسیان گرت، کە هەموویان خاوەن ڕەگەزنامەی بەریتانی و فەرەنسی بوون و بڕێکی زۆر کەلوپەل و ئەو هۆکارانەیان لا بووە کە لە کردەوە تێکدەرییەکان بەکاردەهات، حکوومەتی یەمەنی سەبارەت بەم ڕووداوە، ڕوونی کردەوە کە (ابو الحمزه المصری) کە سەرۆکی نووسینگەی ئەنساری شەریعەیە (مکتب انصار الشریعة) لە لەندەن و باوکی یەکێك لە ئەندامانی ئەو گروپە بوو، ئەوانەی بۆلای (ابو الحسن المحضار) ناردووە، بۆئەوەی کردەی تێکدەرانە ئەنجامبدەن، لەنێو ئەوکردەوانەش ڕفاندنی ئەو (١٦) گەشتیارە ئەوروپیە بوو، کە سوپای عەدەن یارمەتی دارایی و لۆجستی پێشکەش بەو (١٠)کەسە کردووە[1].

ساڵی ٢٠٠٠ ڕووداوێکی دیکەی تیرۆرستی لە یەمەن ڕوویدا، ئەویش تەقاندنەوەی کەشتیگەلی جەنگی ئەمریکی (یو، ئێس، ئێس، کۆل) لە مینای عەدەن، لە ئەنجامی ئەو ڕووداوەدا ١٧ سەربازی سەربە هێزی دەریایی ئەمریکی (مارێنز) کوژران و ٣٩ی دیکەش بریندار بوون، ڕێکخراوی قاعیدە بەرپرسیارێتی خۆی لە ئەنجامدانی ئەم ڕووداوە پیشانداوە، بەمەش یەمەنی زیاتر لەهاوکێشە

---

[1] الافغان العرب، اعداد محمد عبدالعاطی، المصدر جزیرة نیت.

سیاسیه نێودەوڵەتییەکان گلاند و ناچاری کرد زیاتر بەلای بەرەی دژی تیرۆردا بچێت.

دوای ساڵی ۲۰۰۱ و ڕووداوی ۱۱ی سێپتێمبەر، یەمەن بە فەرمی چووەپاڵ بەرەی دژە تیرۆر بە سەرکردایەتی ئەمریکا، بەڵام ئەم هاوپەیمانێتیەی یەمەن لەگەڵ ئەمریکا کۆتایی بە چالاکییەکانی ئەفغانە عەرەبەکان لە یەمەن نەهێنا. بۆیە یەمەن لەگەڵ ئەوەی چووە پاڵ بەرەی دژە تیرۆر، بەڵام لەسەر ئاستی نێوەخۆشی بەدوای ڕێگە چارەی ئاشتیانەدا بگەڕێت، بۆیە قازی (محمود الهتار)ی ئەندامی دادگای بەرزی یەمەنی بە سەرۆکی لیژنەی دایەلۆگی فیکری دیاریکرد بۆ ئەوەی تۆبە (مەبەست لە تۆبەکردن لێرەدا گەڕانەوەیانە بۆ باوەشی حکوومەت) بە ئەندامانی قاعیدە و ئەفغانە یەمەنییەکان بکات، ئەو لیژنەیە بۆ بنبڕکردنی تیرۆر لە یەمەن چوار خاڵی دەستنیشانکرد:

۱- دەستپێکردنی دایەلۆگی ڕاستەوخۆ لەگەڵ (ئەفغانە عەرەبەکان) و (القاعیدە) ئەوانەی دەیانەوێت بگەڕێنەوە ناو ژیانی مەدەنی و توندوتیژییان وەلاناوە.

۲- چارەسەرکردنی گرفتە ئابوورییەکان.

۳- بەهێزکردنی هاوکاری نێودەوڵەتی بۆ نەهێشتنی تیرۆر.

(الهتار) لە دیمانەیەکی ڕۆژنامەوانی (ڕۆژنامەی شەرق ئەوسەت) ڕایگەیاند بوو کە لەوەتەی کار لەسەر ئەم مەسەلەیە دەکات توانیویەتی تۆبە بە (۲٤٦)کەسایەتی ئەفغانە عەرەبەکان و قاعیدە بکات[1].

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ۸۸۱۷، سنة ۲۰۰۳.

# ئەفغانە عەرەبەکان و توندوتیژی سیاسی لە مەغریب

سەروکاری مەغریب لەگەڵ ئەفغانە عەرەبەکان بۆ ساڵی ١٩٨٩ دەگەڕێتەوە[1]،کاتێ (عەبدوڵلا تبارك) ناسراو بە (ابو عمر المغربی) ساڵی ١٩٨٩ بۆ سعودیە و پاکستان چوو، لەوێ وەك مامۆستا لە (هیئة الاغاثة الاسلامیة) کاری کرد.

هەندێ سەرچاوە دەڵێن (تبارك) سەربە کۆمەڵی (اهل السنه والجماعه)ی مەغریبی بووە، پێش ئەوەی بۆ ئەفغانستان بچێ[2].

پەیوەندی ئەفغانە عەرەبەکان بە وڵاتی مەغریب دوای ئەوەی لە بنکەی (گوانتانامۆ)ی ئەمریکی لە ٨ی ئابی ٢٠٠٤ پێنج عەرەب بۆ مەغریب گەڕانەوە، ئەوانە تەواو چیرۆکی ئەفغانی مەغریبیان بۆ دەسەڵاتداران ئاشکرا کرد، ئەوانیش (عەبدوڵلا تبارك، کە وەك پاسەوانی تایبەتی ئوسامە بن لادن ناسرابوو، ابراهیم بن شقرون، محمد اوزار، محمد مزوز، رضوان شقوری) بوون، دوای ئەوەی دوو ساڵ لە بەندیخانەی گوانتانامۆ ژیانیان بەسەربرد تەسلیم بە مەغریب کرانەوە.

ئەمانە هەموویان دوای شەڕی ئەمریکا، لە ئەفغانستان دەستگیرکراون، چیرۆکی هەریەکە لەمانە جیاوازە.

عەبدوڵلا تبارك، کە بەکاری مامۆستایەتی لە (هیئة الاغاثة الاسلامیة)ەوە خەریك بوو، دواتر بۆ سەربازگەی (جاور) لە شاری (خوست) دەچێ، ئینجا بە یەکجاری لە شاری (هیرات) نیشتەجێ دەبێ.

محمد زوز، پێش دەرچوونی لە مەغریب سەر بە هیچ ڕێکخراوێکی ئایینی نەبووە، بەڵام ساڵی ١٩٩٨ بە بیانوی تەواوکردنی خوێندن ڕوو لە ڕوسیا دەکات و

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٩٢٩٩، سنة ٢٠٠٤.

لەوێ لە ژیانی ڕابواردن و خواردنەوە بێزار دەبێ و دەست بەئایینەوە دەگرێ، ئینجا بۆ بەریتانیا دەچێت و دوای دوو ساڵ بۆ ئەفغانستان دەچێت.

رضوان الشقوری، بە ڕێنمایی خوشکەکەی کە ژنی ابو معاذ (نورالدین نفیعه)ی گەورە سەرکردەی (الجماعة الاسلامیة المغربیبة المقاتلة)) بوو بەرەو تورکیا دەچێ، لەوێ لە کارگەی جلوبەرگ کاری دەکرد، پێش ئەوەی بۆ سوریا و ئەفغانستان بچێت، لە ئەفغانستانیش لە سەربازگەکانی دەوروبەری کابوڵ مەشق دەبینێ.

محمد اوزار، لە ساڵی ١٩٩٧ز لەشاری (تورینوی)ی ئیتاڵی دەچێتە پاڵ (جماعة الدعوة والتبلیغ). لەوێشەوە بە پەساپۆرتێکی ساختە بۆ پاکستان و ئەفغانستان دەچێ و لە سەربازگەی لیبیەکان مەشقی بەکارهێنانی چەك و تەقەمەنی دەبینێ.

ساڵی ٢٠٠١ محمد مزوز چاوی بە ئیسلامییە چالاکەکانی مزگەوتی (فینزبری بارك) لە لەندەن دەکەوێ، لەو مزگەوتە لەگەڵ (ابو عبیدة الجزائیری و بشیر التونسی و ابو قتادة الفلسطینی) ئەو وانانەیان دەخوێند کە بۆ جیهادکردن لە بۆسنە و هەرسك و فەلەستین و ئەفغانستان هانیان دەدات، ئەمەش وایکرد بە بیری جیهادی تەیار ببێت.

هەرچی (عەبدوڵڵا تبارك) بوو کە لە مەغریب لەسەر دەستی توندڕەوە مەغریبیەکانی وەك محمد النعمانی (کە سەربە کۆمەڵی الدعوه والتبلیغ) بوو، بەبیری جیهادی تەیار کرابوو، ئەمەش وای لێکرد پەیوەندی بە (کۆمەڵی العدل والاحسان) بەسەرکردایەتی شیخ عەبدوڵڵا یاسین، بکات، بەڵام بەڕێنمایی (ابو معاذ) لە مەغریب بۆ پاکستان بچێ، هەر ئەویش لە (هیئة الاغاثة الاسلامیة) لە پشاوەر بە مامۆستا دایمەزراند.لە (بیت الانصار) چاوی بەموجاهیدانی عەرەب دەکەوێ و کاریگەر دەبێ پێیان و لە سەربازگەی (جاور) مەشقی سەربازی و چەك دەبینێ.

دوای ئەوەی زۆر کاریگەر دەبێ بەیەکێ لە وتارەکانی ئوسامە بن لادن کە لە بنکەی (الانصار) پێشکەشیکرد، ساڵی ١٩٩٠ بۆ مەغریب دەگەڕێتەوە، بۆ

ئەوەی ژن و ماڵ و منداڵەکانی بۆ ئەفغانستان بەرێ، دوای گەڕانەوەی بۆ ئەفغانستان پەیوەندی بە قاعیدەوە پتەوتر دەبێ، لە هەرێمی (حیاه اباد) نیشتەجێ دەبێ، ئەم پەیوەندییەش بەهۆی (الشیخ سعید المصری)ەوە بوو، کاتێ ١٩٩٢ وەك سەرپەرشتیاری گواستنەوەی خۆراك و یارمەتی لە (میرنا شاه)وە بۆ سەربازگەکانی مەجاهیدان لە (جهاد وال)، دایمەزراند.

دوای گوشارەکانی پاکستان بۆ سەر ئەفغانە عەرەبەکان، عەبدوڵلا تبارك بڕیار دەدات لەگەڵ شاندی ئوسامە بن لادن لە پاڵ (ابو احمد المصری و رضا التونسی و ابو الحسین اللیبی) بۆ سودان بچێ و لەوێ بە بەخێوکردنی مەڕوماڵاتەوە خەریك بوو، بەڵام دوای ئەوەی (شیخ سعید المصری) مەسەلەی ئیشکردنی لەگەڵ باسکرد، پێی باش بوو ببێتە پاسەوانی تایبەتی ئوسامە بن لادن.

ساڵی ١٩٩٦ دوای ئەوەی سودان فشاری بۆ هێنان، لەپاڵ (٤٠) خانەوادەی عەرەبی دیکە بۆ ئەفغاسنتان دەگەڕێتەوە.

لە شەڕی ئەمریکا بۆ سەر ئەفغانستان و بزووتنەوەی تالیبان، عەبدوڵلا تبارك لەگەڵ کۆمەڵێ سعودی لەسەر سنووری پاکستان دەستگیردەکرێن و ڕەوانەی بنکەی گوانتانامۆ دەکرێن.

(الجماعة المغربیة المقاتلة) یەکێکە لەو ڕێکخراوانەی کە یارمەتی و پاڵپشتی بۆ قاعیدە ئەنجامداوە، رضوان الشقوری دەڵێ: خوشك و براکەم داوایان لێکردم بۆ تورکیا سەفەر بکەم، لەوێش چاوم بە (محمد الکربوزی)و (جاوید)، کەوت. منیان بۆ (میوانخانەی مەغریبیە ئەفغانییەکان) لە ئەفغانستان برد.ئەمانە کە سەربە (الجماعة المغربیة المقاتلة) بوون یارمەتی و هانی گواستنەوەی ئەو لاوە مەغریبیانەیان داوە کە دەیانەویست لە ئەفغانستان جیهاد بکەن.

# پەیوەندی

## ئەفغانە عەرەبەکان و ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا

پەیوەندی نێوان ئەفغانە عەرەبەکان و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە دوو قۆناغی جیاواز و دژ، گوزەراوە، لە پەیوەندیەکی هاوپەیمانی بۆ ململانێ و پێکدادان، گۆڕاوە[1]:

یەکەم: قۆناغی هاوپەیمانی و یارمەتیدان: لە سەرەتای سالآنی هەشتاکان تا کۆتایی (جیهادەکە)، ئەمریکا بەهەموو قورساییەکەوە، یارمەتی جیهادی ئەفغانی دژ بە بوونی سۆڤیەت لە ئەفغانستان، لە بەر چەند فاکتەرێکی ستراتیژی، داوە، ماوەی سالآنی ١٩٧٠-١٩٨٠ فراوانخوازییەك لە کاریگەری کۆمۆنیستی لە ئەمریکای لاتینی و ئەفریقیا و ئاسیا هاتە پێش، بە دیدی ئەمریکا دەبوایە ئەم فراوانخوازییەی سۆڤیەت (کۆمۆنیستی) ڕابگیرێت. ڕۆناڵد ڕیگنی سەرۆکی ئەوسای ئەمریکا سوربوو لەسەر ئەوەی بەر لە فراوانخوازی سۆڤیەت بگرێت، هەتا ئەگەر لە یەك شوێنیش بێت، هەرچەندە ئەو کات سۆڤیەت و ئەمریکا ڕاستەوخۆ ڕووبەڕوو نەدەچوونە ناو شەڕوکێشەکانەوە،بەلآم لە چوارچێوەی ململانێیەکدا کە پێی دەگوترا(شەڕی سارد) کێشەکانیان یەکلایی دەکردەوە، ئەوکاتیش ئەفغانستان گۆڕەپانێکی لەبار بوو بۆ ئەو بەر بەرەکانێکردنە، هەر لەسەر ئەم بنەمایەش هاوپەیمانێتی سەربازی لە نێوان ئەمریکا و ئەفغانە عەرەبەکان دامەزرا، مەبەستی ئەمریکا لەو هاوپەیمانێتیە لاوازکردنی سۆڤیەت بوو. ئەوکات بە خەیاڵی سەرانی ئەمریکادا نەدەهات کە ئایا ئەفغانە عەرەبەکان دوای تێکشکانی سۆڤیەت چی دەکەن؟ لەماوەی نێوان

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٩٣٩٧، سنة ٢٠٠٤.

سالانی هەشتاکان واشنتن مەزارگەی سەرانی ئەفغانییە جیهادکەرەکان بوو، ئەو کات هۆیەکانی ڕاگەیاندنی ئەمریکی بە ئەوانی دەگوت: (جەنگاوەرانی ئازادی — The Afghan Freedom Fighters)، ئەمریکا یارمەتی زۆری سەرۆکی پاکستان، (ضیاء الحق)ی داوە کە داوای لە موسوڵمانانی هەموو جیهان کرد بەشداری لە شەڕی دژ بە سۆڤیەت بکەن، دەزگای هەواڵگری ئەمریکی (C.I.A) لە ڕێگەی سوپا و دەزگای هەواڵگری پاکستانەوە یارمەتی ماددی و چەکی موجاهیدانی ئەفغانی و ئەفغانە عەرەبەکان داوە، C.I.A بنکەی سەربازیی پێشکەوتووی بۆ مەشقی ئەوان دامەزراند، هەندێ لەو بنکە سەربازیانە لە دەوروبەری شاری (خوست) و سەر سنووری پاکستان و لەنزیك جلال ئاباد، کرانەوە.

هەندێ وایدەبینن کە یارمەتی ماددی سعودییەکان چوار هێندەی ئەمریکییەکان بووە، هەروەك ئەوەی C.I.A سوودی لە توانا داراییەکانی ملیاردێری سعودی (ئوسامە بن لادن) لە پێناو پرۆسەی خۆبەخشین وگەشەدان پێی، وەرگرتوە. بەم شێوەیە هەردوولایەنی ئیسلامی (فەرمی و نافەرمی) و ئەمریکی لەسەر یەك ئامانج یەکیان گرتەوە، ئەویش تێکشکاندنی یەکێتیی سۆڤیەت بوو. لە ڕاستیدا هەردوولایان یارمەتییە پێویستییەکانیان پێشکەش کرد، بەڵام کۆتایی هاتنی هاوکێشەی (ئیسلام + ئەمریکا = تێکشکاندنی سۆڤیەت)، دووبارە دروستکەرانی بڕیاری ئەمریکی لە بەردەم پرسیاری تازەدا دانا، بەواتایەکی دیکە، بەکۆتایی هاتنی شەڕی دژ بەسۆڤیەت بیریاران و سیاسەتمەدارانی ئەمریکی، ئەوەندە گرنگییان بەو ڕەوتە ئیسلامییە چەکدارانە دەدا، کە تا دوێنێ لە هاوپەیمانێتی نهێنیدا بوون بە یەکەوە، سەبارەت بە ئەمریکا، کۆتایی هاتنی سۆڤیەت، ئەو مەترسییە ستراتیژییەی کە ئەمریکا هەزار حسابی بۆ دەکرد، نەما. ڕوودانی شەڕی کەنداوی دووەم و باڵادەستی ئەمریکا لە ناوچەکە، ئەم دووگۆڕانە (تێکشکانی سۆڤیەت + ئامادەبوونی ئەمریکی لەکەنداو) بیریارانی ئەمریکی وەك (هانتگتۆن)ی هاندا کە بیر لە

دوژمنێکی تازە، تیۆری (کۆتایی مێژوو) بڵاوبکەنەوە و بڕیارێکی بە پەلە لەسەر سەرکەوتنی بیری لیبراڵی ئەمریکی بەسەر بیری کۆمۆنیستی ڕووسیدا بدەن، ئەوان پێیانوابوو دوای نەمانی سۆڤیەت هێزەکان لە شێوەی دیکە جەمسەرگیری دەبەستێ، ئەویش لە شێوەی شارستانییەکان، کە شارستانێتی (ئیسلامی + کۆنفۆشیۆسی) لەگەڵ شارستانێتی (مەسیحی) دەکەوێتە ململانێ و شەڕی ئایندە لەسەر ئەم بنەمایە دەبێت.

هەرچەندە بە شێوەیەکی فەرمی ئیدارەی ئەمریکی ئەم دیدەی پەسەند نەکردوە، چونکە لە گرنگی پەیوەندییەکانی خۆی بە وڵاتانی ئیسلامی تێدەگات، بەڵام ئەوە ڕێگەی لە ئەمریکا نەگرت (تیرۆر) وەك دوژمنێکی تازە، بەتایبەتی تیرۆری ئوسوڵی کە بە سەرکردایەتی (ئەفغانە عەرەبەکان) دەچێتە پێش، پۆلێن بکات.

بەمجۆرە، تێڕوانینی ئەمریکا بۆ (موجاهیدانی ئەفغان) دوای دەرچوونی سۆڤیەت لە ئەفغانستان بەخێرایی گۆڕا. دوای کشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت ساڵی ١٩٨٩ لە ئەفغانستان، کێشە لە نێوان دروستکەرانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا سەبارەت بە دۆسیەی ئەفغانی دروست بوو، هەندێ پێیان باش بوو لە ڕێگەی سەرانی سۆڤێتەوە مامەڵە لەگەڵ کێشەکەدا بکرێت، هەرچی دەزگا سەربازی و هەواڵگرییەکانی ئەمریکا بوو، پێیان باش بوو، بۆ مەبەستی ڕووخانی ڕژێمەکەی (نجیب الله) پێویستە یارمەتی گروپە ئەفغانییەکان بدرێت، ئەو یارمەتیانەی ئەمریکا دوای کشانەوەی سۆڤیەت لە (٣٠٠) ملیۆن دۆلارەوە بۆ (٢٥٠) ملیۆن دۆلار کەمکرایەوە، دواتر بە هاوکاری سعودیە هەموو یارمەتییەکە لەو پارت و لایەنە سیاسیانەی کە پاڵپشتیان لە داگیرکاری عێراق بۆ کوێت یان دەستتێوەردانی ئەمریکییەکان لە کاروباری کەنداو ڕەتکردەوە، بڕا. ئەوانیش (حزبی ئیسلامی) بە سەرۆکایەتی (حکمتیار) و (یەکگرتووی ئیسلامی) بە سەرۆکایەتی (عبدرب السیاف) بوون. ئەم گۆڕانی هەڵوێستە بۆ

هەڵوێستەکانی سعودیە و پاکستانیش درێژبووەوە، دواتر بۆ یارمەتیدانی گروپێك لە دژی گروپێکی دیکە گۆڕا، کە ئەمەش وایکرد گروپێکی دیکەی وەك (بزووتنەوەی تالیبان) دروست ببێ. ئەمریکا ڕژێمەکەی (برهان الدین الربانی) وەك باشترین ڕژێم بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دەبینی، بە تایبەتی دوای ئەوەی پێکدادان لە نێوان (حکمتیار و ربانی)دا ڕوویدا. بەرژەوەندی ئەوسای ئەمریکاش لەوەدابوو، سەربازگەکانی ئەفغانە عەرەبەکان دابخرێت و سەرکردەکانی دەستگیر بکرێن. کاتێکیش بزووتنەوەی تالیبان دەرکەوت، هەریەکە لە ئەمریکا و هەردوو حکوومەتی پاکستانی و سعودی گرەویان لەسەر کرد، بە تایبەتی دوای ئەوەی سەرکەوتوو بوو لە کەمکردنەوەی دەسەڵات و هێزی (حکمتیار)، کاتێك بزووتنەوەی تاڵیبان ساڵی ١٩٩٤ پاڵپشتییەکی فراوانی ئەمریکی و پاکستانی هەبوو، چونکە خاوەنی هێزێکی سەربازی زەبەلاح بوو، کە لە (٢٥) هەزار چەکدار و (٢٠٠) تانك پێکهاتبوو، سەرباری (٢٠٠) فڕۆکەی جەنگی. ئامانجەکانی ئەمریکاش لە یارمەتیدانی بزووتنەوەی تالیبان ئەمانەبوون:

أ- ڕاگرتنی ڕەوشی ئەفغانستان و هێنانەدی ئارامی.

ب-ڕاوەدوونانی ئەفغانە عەرەبەکان.

ج- وەستاندنی بازرگانیکردن بە ماددەی بێهۆشکەر.

د- هێنانە سەرکاری دەسەلاتێکی لایەنگر بۆ ئەمریکا.

هـ- نزیکبوونەوەی هێزەکانی ئەمریکا و دەسەڵاتی ئەمریکی لە هەرێمە نەوتییەکانی ئاسیای ناوەڕاست.

و- دوورخستنەوەی نفووزی ئێرانی لە ئەفغانستان و زیاتر گەمارۆدانی.

ز- دوور خستنەوەی ئێران لە پڕۆژەی ڕاکێشانی هێڵی نەوت و گازی سروشتی لە تورکمانستانەوە بۆ پاکستان بەناو ئەفغانستاندا، لەجیاتی ئەوەی بەناو ئێراندا بگوازرێتەوە.

لەڕاستیدا کاتێ بزووتنەوەی تالیبان دەسەڵاتی گرتە دەست، حکمتیار دەسەڵاتی نەماو، سەربازگەکانی مەشقکردنی ئەفغانە عەرەبەکان داخران و کێلگەکانی ماددە بێهۆشکەرەکان سوتێنران، ئەم کارانەی تالیبان تەواو لەگەڵ خواستەکانی ئەمریکا هاتەوە، بەڵام بزووتنەوەکە هەربەردەوام بوو لە داڵدەدانی ئوسامە بن لادن و لایەنگرانی، بەتایبەتی دوای گەڕانەوەی ئوسامە بن لادن لە سودان و هەروەها تالیبان زۆر بەتوندی بەرپەرچی ئەو داوایەی ئەمریکای بەدەستگیرکردنی ئوسامە بن لادن ساڵی ١٩٩٧ دایەوە. بۆ ئەم مەبەستە ئەمریکییەکان هێزێکی تایبەتیان ناردە پاکستان بۆ ئەوەی لە سنووری پاکستانەوە بچێتە ناو ئەفغانستان و ئوسامە بن لادن دەستگیر بکات، بەڵام دەسەڵاتدارانی تالیبان ڕێگەیان بەو هێزە نەدا بێنە ناو ئەفغانستان، هەروەك باسمانکرد کاتێ ئوسامە بن لادن لە سودان بۆ ژێر دەسەڵاتی تالیبان گەڕایەوە، مەلا محمد عومەر بەتایبەتی داوای لە ئوسامە کرد جارێ هیچ چالاکییەکی سیاسی ئەنجام نەدات و خۆی لە هۆیەکانی ڕاگەیاندن دوور بخاتەوە، دیارە ئەمەش بۆ ئارامکردنەوەی ڕەوشی ناسکی ئەوسای تالیبان بوو، بەڵام زۆری نەبرد ئوسامە ڕێگەی پێدرا چالاکی سیاسیی فراوان دژ بە سیاسەتەکانی ئەمریکا دەست پێبکات، دوای ساڵێك واتە ساڵی ١٩٩٨ ئوسامە سەرکەتوو بوو لە کۆکردنەوەی زۆرێك لەسەرانی ئەو گروپ و پارتە ئیسلامییە توندڕەوانەی جیهان و بەرەیەك بە ناوی (بەرەی ئیسلامی جیهانی بۆ جیهادکردن دژ بە یەهود و خاچپەرستەکان) لە دژی ئەمریکییەکان بکاتەوە و سەرباری ئەوەی چەندین کۆنگرەی لە دژی سیاسەتەکانی ئەمریکا بەڕێوەبرد، بەڵام تەقاندنەوەی هەردوو باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە (کینیا و تەنزانیا) ١٩٩٨/٨/١٨ کێشەی داڵدەدانی ئەفغانە عەرەبەکانی لای تالیبان کردە مەسەیەلەکی مەترسدار، بە تایبەت دوای ئەوەی واشنتۆن سەربازگەکانی سەربە ئوسامە بن لادنی لە ئەفغانستان لە ١٩٩٨/٨/٢٠ بۆردومان کرد.

پێدەچێ تێڕوانینی ئەمریکی بۆ کێشەی ئەفغانی خودان ستراتیژێکی ڕوون نەبووبێ، ئەم ناڕوونیەش خۆی لە:

أ- ئەو پاڵپشتی و یارمەتییەی ئەمریکا لە سەر بنەمای ستراتیژی کە ئامانجی دامەزراندنی ڕژێمێکی سیاسیی ئارام لە ئەفغانستان، دانەمەزرابوو، پێدەچێ ئەمریکییەکان ئەوەندە گرنگییان بە نەخشەی سیاسی و مەسەلەی ئەتنی و دابەشبوونی گروپە ئەفغانییەکان و فرە کێشەیی نەدابێ، تەنها جەختیان لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسی کۆمۆنیستی کردبێت، هەروەها بڕیاربەدەستانی ئەمریکا بوونی (خۆبەخشە عەرەبەکان)ی ئەفغانستانیان، بەهێند وەرنەگرتبێ بە تایبەت دوای دەرچوونی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئەفغانستان، ئەمەش وایکرد (جیهادکەرانی عەرەب) ببن بە (ئەفغانە عەرەبەکان)، بەڕای زۆربەی چاودێران ئەمریکییەکان تەنها گرنگیان بە مەودا دەولی و ئیقلیمیەکانی کێشەی ئەفغانی دەدا و ئەوەندە گرنگییان بە مەودای ململانێیە نێوخۆییەکانی ئەفغانستان نەدەدا.

ب- ئەو گرەوانەی ئەمریکا لە سەر بزووتنەوەی تالیبانی دەکرد، بەردەوام سیاسەتی ئەمریکا لە بەردەم دوو ئەگەر دادەنا، یا ئەوەتا یارمەتی تاڵیبیان دەدات بۆ بەدیهێنانی ڕژێمێکی سیاسیی ئارام و ئێرانی پێ دەرە دەدات و پرۆژەی هێڵی نەوتی پێدا تێدەپەڕێنێ، یا ئەوەتا ئەو دەوڵەتەی تالیبان گەشە دەکات و شەپۆلی ئایدیۆلۆژیای دەوڵەتی دینی دەگاتە ئاسیای ناوەڕاست و ڕژێمە حاکمەکانی ئەویش دەلەرزێنێ.

بەکورتی ئەمریکا مەسەلەی (جیهادی ئەفغانی) خستە خزمەت دژایەتیکردنی قەڵەمڕەوی سۆڤیەت، بەڵام دەرچوونی سۆڤیەت لە ئەفغانستان و ڕووخانی ڕژێمی سۆسیالیستی وایکرد تێڕوانینی ستراتیژی ئەمریکی بۆ کێشەکە بگۆڕێت، لەجیاتی ئەوەی ئەمریکا لە فراوانخوازیی ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزمی بترسێ، ئەمجارەیان ترسێکی دیکە بۆ ئەمریکا سەریهەڵدا، ئەویش ترس لە ئایدیۆلۆژیای (ئەفغانە عەرەبەکان) بوو کە دژایەتی سەرسەختی ئەمریکایان لە ناوچەکە دەکرد.

## دووەم: قۆناغی ململانێی ئەمریکا — ئەفغانە عەرەبەکان

سەرەتاکانی ئەم قۆناغە ڕێك بۆ دوای کشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت لە خاکی ئەفغانستان و دواتر هەڵوەشاندنەوەی یەکێتیی سۆڤیەت دەستپێدەکات، واتە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨٩-١٩٩٠)، چونکە لەم ماوەیەدا ئەفغانە عەرەبەکان بەدوای گۆڕەپانی دیکەی جیهاد دا دەگەڕان و ژمارەیەکی زۆریان ڕوویان لە شوێنە گەرمەکانی ڕووداو کرد وەك (بۆسنە و هەرسك و کەشمیر و چیچان و میسر و جەزائیر و فەلەستین...)، ئەمانە هەڵگری بیروڕای جیهادی بوون و سنوور بۆ ئەوان چ مانایەکی نەبوو، سەرباری ئەوەی کە لە ماوەی مەشق و ڕاهێنان و وانەی عەقائیدی بە بیروڕای دژایەتیکردنی ئەمریکا بارگاوی کرابوون، پێویستیان بە زەمینەیەکی لەبار بوو بۆ خاڵیکردنەوەی ئەو بارگانە و بەدیهێنانی ئامانجە جیهادییەکانیان، بۆیە لە هەموو دونیا بوونی ئەمریکی و هێزە ئەمریکییەکان و بەرژەوەندی ئەمریکییەکانیان کردە ئامانجی خۆیان، لەمەشدا بە چەندین فتوای شێخانی جیهادی و سەلەفی و سەحوەوی تەیارکرابوون.

هەرچەندە چالاکی ئەفغانە عەرەبەکان لە سەرەتادا دژ بە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا تا ڕوودانی ڕووداوی ١١ی سێپتێمبەر جگە لە شێوازێك بۆ دژایەتیکردن و ڕەخنەگرتن لە سیاسەتەکانی ئەمریکا زیاتر نەبوو، کە ئەمریکا دژ بە عەرەب و موسوڵمانان ئەنجامیدەدا، لە ڕاستیدا ئەو هێرشانەی ئەفغانە عەرەبەکان لە ماوەی ساڵانی ١٩٩١ بەدواوە بۆ ئەمریکا بە هەڕەشەیەکی جددی ئەوتۆ وەرنەدەگیرا.

**ئەمەش چەند نمونەیەکە لەو کردەوانەی ئەفغانە عەرەبەکان دژ بە ئەمریکا:**

أ- ساڵی ١٩٩٣ زنجیرەیەك هێرشیان کردە سەر هێزە ئەمریکییەکان، کە بووە هۆی کوژرانی (١٨) سەربازی ئەمریکی. ئەم هێرشانەش بە هاوکاری

(یەکگرتووی ئیسلامی سۆماڵی) ئەنجامدەدران، کە بووە هۆی کشانەوەی هێزە ئەمریکییەکان لە سۆماڵ.

ب- ساڵی ١٩٩٥ تەقاندنەوەی سەنتەری بازرگانی جیهانی لە نیۆیۆرك، کە بووە هۆی کوژرانی شەش کەس و برینداربوونی نزیکەی هەزاری دیکە و زیانەکانیش بە یەك بلیۆن دۆلار مەزەندە کرا، ڕەمزی یوسف و احمد عجاج ئەو هێرشانەیان ئەنجامدا، ئەوانە لە ئەفغانستانەوە مەشقیان بینیبوو و فێری تەقاندنەوە کرابوون.

ج- تەقاندنەوەی نووسینگەی شاندی سەربازی ئەمریکی لە ریاز ساڵی ١٩٩٥ کە بووە هۆی کوژرانی (٥) ئەمریکی و (٢) هیندی و برینداربوونی (٦٠) ی دیکە.

د- یونیوی ساڵی ١٩٩٦ تەقینەوەکەی (الخبر) لە (ظهران) ئەنجامدرا، لەئەنجامدا (١٩)ئەمریکی کوژران و (٣٨٦)کەسی دیکە بریندار بوون کە (١٧) سعودی و (١١٨) بەنگالی و (١٠٩) ئەمریکی و (٤) میسری و (٢) ئوردنی بوون. ساڵی ١٩٩٨ ئەفغانە عەرەبەکان (بەرەی ئیسلامی جیهانی بۆ دژایەتی یەهود و سەلیبییەکان) یان دامەزراند. ئەو بەرەیە، بەڵێنی ئەوەی دا کە گەورەترین گورز لە ئامانجە ئەمریکییەکان بوەشێنێ، ١٩٩٨/٨/٧ هەردوو باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە کینیا و تەنزانیایان تەقاندەوە، کە بووە هۆی مردنی (٢٦٣) کەس کە لەنێوانیان (١٢) ئەمریکی هەبوون و برینداربوونی (٤) هەزاری دیکە. ئەوکات سوپای ئیسلامی بۆ ڕزگارکردنی شوێنە پیرۆزەکان (الجيش الاسلامي لتحرير المقدسات الاسلامية) بەرپرسیارێتی خۆی لە ئەنجامدانی ئەو کردەیە ڕاگەیاند، کە پێدەچێ لاباڵی سەربازی ڕێکخراوی قاعیدە بێ، لەو بەڵگانەی دیکە ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەو تەقینەوەیە ئەفغانە عەرەبەکان ئەنجامیاندابێت، ئەو بەیانەی (تنظيم الجهاد) ی میسری بوو، کە دوو ڕۆژ پێش تەقینەوەکان بە بۆنەی تەسلیمکردنەوەی چوار لە چالاکەکانی ڕێکخستنەکە کە

به دەسەڵاتدارانی میسری لەلایەن ئەمریکییەکانەوە، بڵاوکرایەوە کە جیهادی میسری گەورەترین گورز لە ئەمریکییەکان دەدات، ڕێکخستنی جیهادیش کە بەشێکە لە (بەرەی ئیسلامی جیهانی) ئەو بەرەیەی کە لە بەیانێکدا ئەمریکای بە دوژمنی یەکەمی خۆی داناوە، بۆ ئەمەش پشتی بە فتوای (لە سەر موسوڵمانان واجبە شەڕی ئەمریکییەکان بکەن) بەستوە.

ساڵی ١٩٩٨ دژایەتی ئەفغانە عەرەبەکان بۆ ئەمریکییەکان دەگاتە ڕاددەیەك چیتر بۆ ئەمریکییەکان ناچێتە سەر، ئەو هێزە ڕوو لە گەشەیەی ئەفغانە عەرەبەکان پشتگوێ بخەن و بە هەڕەشە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی خۆیان حسابی بۆ نەکەن. وەرچەرخانێکی ڕیشەیی لە بیری عەرەبە ئەفغانەکان لە ماوەی ساڵانی ١٩٩١ تا ١٩٩٨ هاتەدی، ئەویش ئەوەبوو کە لەجیاتی ئەوەی بە شەڕکردن لە دژی حکوومەتەکانی وڵاتەکانیان خەریکبن باشترە شەڕی ئەمریکا و سەهیۆنی بکەن، چونکە ئەوان پاڵپشتی سەرەکی حکوومەتە ناشەرعییەکانی وڵاتانی عەرەبی و موسوڵمانانن. بەم وەرچەرخانەش ئەفغانە عەرەبەکان توانیان سۆز و پاڵپشتی موسوڵمانانی جیهان بۆلای خۆیان ڕابکێشن و سنووری چالاکییەکانیان لە چوارچێوەی وڵاتەکانیان بۆ ئەودیوی سنوور ببەزێنن، بە هەموو دونیای ڕابگەیەنن کە دوژمنی سەرەکی ئەوان ئەمریکایە، لە بەرانبەریشدا ئەمریکا لە ڕێگەی هەواڵگری و سیخوڕییەکانی کەوتەخۆ بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر ئەفغانە عەرەبەکان و ڕێکخراوی قاعیدە، گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ڕێکخراوی قاعیدە ڕێکخراوێکی فراوانە و هێز و دەسەلاتێکی زۆری هەیە و دەیەوێت لە هەر شوێنێ گورز لە هێزەکانی ئەمریکا و بەرژەوەندییەکانی بوەشێنێ.

ساڵی ١٩٩٩ ئەمریکا گەمارۆی ئابووری بەسەر حکوومەتەکەی بزووتنەوەی تالیبان (الامارة الاسلامیة الافغانیة)دا سەپاند، ئەمەش وەك هەوڵێك بۆ ناچارکردنی ئەو بزووتنەوەیە تاکو بن لادن تەسلیم بکات و چیدیکە ڕێگە بە ئەفغانە عەرەبەکان و قاعیدە نەدات خاکی ئەفغانستان بۆ کردە تیرۆرستییەکان دژ بە ئەمریکا بەکاربهێنێ.

ئەم هەولانەی ئەمریکا ڕێگرنەبوون لە بەردەم بزووتنەوەی چالاکی ئەفغانە عەرەبەکان کە چیدی گورزی کوشندە لە ئەمریکا نەدەن، ئەوەبوو لە ١١ی سێپتێمبەری ٢٠٠١، وەك ئەمریکا هەرگیز چاوەڕێی نەدەکرد کە دەستی قاعیدە بگاتە ناو جەرگەی ئەمریکا بەو قەبارە گەورەیە و بەو شێوازە تەواو جیاوازە، فڕۆکەی مەدەنی بۆ ئامانجە سیاسییەکانی خۆی بەکارهێنێ و گەورەترین گورز لە هەناوی ئەمریکا بوەشێنێ.

بۆ ئەوەی ڕادەی ئەو گورزە و ئاستی کارکردنی قاعیدە لە ناو جەرگەی ئەمریکا، بزانین. واباشە باسی (ڕووداوی ٢٠٠١/٩/١١) بکەین، چ وەك ئەوانەی ئەو کردەوەیان ئەنجامداوە چ وەك بەڵگەکانی دەست هەبوونی قاعیدە لەم ڕووداوە:

ئەو کەسانەی کە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی (مكتب التحقيقات الفدرالية FBI) لە ڕفاندن و تەقاندنەوەی فڕۆکەکان بە هەردوو تەلاری بازرگانی جیهانی لە نیۆیۆرك و باڵەخانەی پەنتاگۆن لە واشنتن، تاوانباری کردوون، ئەمانەن:

### أ- ئەوانەی لە تەلاری باکوور تۆمەتبار کراون:

١- محمد عطا: سەرۆکی فڕۆکە ڕفێنەرەکان بووە، بە ڕەگەز میسرییە و لە دایکبووی ساڵی ١٩٦٨-ە، لە هۆلیۆد و هامبۆرك لە ئەڵمانیا نیشتەجێ بووە، ئەمریکییەکان لەو باوەڕەدان کە شۆفێری ئەو فڕۆکە بووە کە خۆی بە یەکێك لە تەلارەکانی بازرگانیدا کێشاوە، محمد عەتا لە هامبۆرگ ئەندازیاریی مەدەنی تەواو کردووە، ساڵی ٢٠٠٠ مەشقی فڕۆکەوانی لە ویلایەتی فلۆریدا بینیوە، ئەوانەی لەگەڵی هەستاون و دانیشتوون دەڵێن محمد عەتا کەسێکی توندڕەو و ئاژاوەگێڕ نەبوو، بەڵکو هێمن و لەسەرخۆبوو، ئارەق و ماددەی بێهۆشکەری بەکارنەدەهێنا و تەوقەی لەگەڵ ژناندا نەدەکرد، (FBI) لەو باوەڕەدایە محمد عەتا و دوو قوتابی هەمان زانکۆ ئەو سێ فڕۆکەیان لێخوڕیوە کە لە هێرشەکان

بەکارهاتوون. لێکۆڵەرەوە ئەمریکییەکان چەند بەڵگەنامەیەکی دەستنووسی محمد عەتایان دەستکەوتووە کە ڕێنمایی و دوعاو پاڕانەوەیان تێدا نووسراوە کە ڕۆژێك بەر لە ڕووداوەکە نووسراون.

٢- ولید الشهری: بە ڕەگەزنامە سعودیە و لە دایکبووی ١٩٧٤، لە فلۆریدا و ڤێرجینیا نیشتەجێ بووە و وانەی فێربوونی فڕۆکەوانی وەرگرتووە.

٣- وائل الشهری: زانیاری لە بارەیەوە کەمە، لە ساڵی ١٩٦٨ لە دایکبووە، کوڕی دیپلۆماتێکی سعودیە و برای (ولید الشهری) ە، لە فلۆریدا بلیتی فڕۆکەی بڕیوە و لە شاری نیوتن شەو ماوەتەوە.

٤- سطام السقامی: لە فلۆریدا نیشتەجێ بووە و ڕەگەزنامەی سعودی هەڵگرتووە، لە ساڵی ١٩٧٦ لە دایکبووە، لێکۆڵینەوەکان دەریانخستوە کە پەیوەندی بە (رائد الحجازی) تۆمەتبار بە پیلاندانان بۆ کوشتنی ئەمریکییەکان و گەشتیاران لە ئوردون، هەبووە.

٥- عبدالعزیز العمری: سعودیە و لە دایکبووی ١٩٧٢، فێری فڕۆکەوانی بووە، لە فڕۆکەخانەی (بورتلاند) لەگەڵ محمد عەتا بینراوە.

### ب- ئەوانەی لە تەلاری باشوور تۆمەتبار کراون

١-مروان الشیهی: تەمەنی ٢٧ ساڵە، لە خزمەکانی محمد عەتایە و یەکەم یارمەتیدەری بووە، باوەڕ دەکرێت کە شوفێری فڕۆکەکە بووبێ. بە یەکەوە لەگەڵ (محمد عەتا) لە یەك هۆتێل ژیاون کاتێ خەریکی فێربوونی فڕۆکەوانی بوون لە (قوتابخانەی هۆفمان)ی فڕۆکەوانی.

٢-فایز بنی محمد: دەسەڵاتدارانی ئەمریکی نەیانتوانیووە، ڕەگەزنامەکەی دیاری بکەن، لە فلۆریدا ژیاوە زۆر نازناوی بۆخۆی بەکارهێناوە، لەوانە فایز احمد کە لە قوتابخانەی (سبارتان) بۆ فیربوونی فڕۆکەوانی بەکاریهێناوە، لە تۆمارەکانی پەناهەندەش ناوی فایز احمد هاتووە کە ساڵی ٢٠٠٠ بۆ فلیپین چووە.

٣-احمد الغامدی: ئەویش ڕەگەزنامەی دیاری نەکراوە، هەتاکو شوێنی نیشتەجێبوونیشی دیارنییە، ئەوەندە دەزانرێت کە ساڵی ١٩٩٥ مۆڵەتی شۆفێری لێسەندراوەتەوە لە بەرئەوەی پارەی سزا بەزاندنی نیشانەی هاتووچۆی نەداوە، تۆماری پەناهەندەکانی فلیپین ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ناوبراو چەند جارێك سەردانی فلیپینی کردووە.

٤-حمزە الغامدی: زانیاری لە بارەی ڕەگەزنامە و تەمەنی نییە، لەوانەیە لە فلۆریدا ژیابێت، یەکێکە لە چوار ڕفێنەرەکان.

٥-مهند الشهری: زانیاری لە بارەیەوە نییە، تەنها ئەوە نەبێ سێ نازناوی بەکارهێناوە، باڵیۆزخانەی سعودیش دەڵێت ناوبراو بۆتە قوربانی هەڵەتێگەیشتن لە ناسنامەکەی.

## ج- ئەوانەی لە تەلاری پەنتاگۆن تۆمەتبار کراون:

١-هانی حنجور: تەمەنی ٢٩ ساڵ و شوفێری فڕۆکەکە بووە، ڕەگەزنامەی سعودی هەبووە، ١٠ ساڵ پێش هێرشەکە لە ئەمریکا ژیاوە، لە یەکێك لە قوتابخانەکانی فێرکردنی فڕۆکەوانی لە ڤێرجینیا ئامادە بووە، ساڵی ١٩٩٩ مۆڵەتی لێخوڕینی فڕۆکەی وەرگرتووە.

٢-خالد المحضار: تەمەنی ٣٠ ساڵە و ڕەگەزنامەی سعودی هەبووە، دوای ئەوەی دەزگای هەواڵگری ئەمریکی وێنەیەکیان لەگەڵ سەرکردەکانی قاعیدە چنگ کەوت، (المحضار)یان لە ژێر چاودێری دانا، ئەو وێنەیەش لەکۆبوونەوەیەکی قاعیدە لە (کوالالامبور) گیراوە. دووجار توانیویەتی بێتە ناو ئەمریکا، یەکێکیان بەماوەیەکی کەم لە دوای کۆبوونەوەکەی (کوالالامبور) ئەوەی دیکەیان ساڵی٢٠٠١، بەبێ ئەوەی دەستگیر بکرێت.

٣-ماجد موقد: تەمەنی ٢٤ساڵە و خاوەنی ڕەگەزنامەی سعودیە و لە ویلایەتی ڤیرجینیا مۆڵەتی شۆفێری وەرگرتووە.

٤-نواف الحازمی: ڕەگەزنامەی سعودی هەڵگرتووە، لە زیاتر لە شوێنێك دانیشتووە، لەگەڵ (المحضار) لە ژێر چاودێری دابووە، پێش چەند هەفتەیەك بڕیاری دەستگیرکردنیان بۆ دەرچووە، لەگەڵ المحضار و هانی حنجور لە یەك هۆتێل ژیاون، ئەو ئۆتۆمبێلەی کە بەکاریهێناوە لە نزیك فڕۆکەخانەی (دۆلس) دوای ڕۆژێك لە هێرشەکان دۆزرایەوە. لە ناو ئۆتۆمبێلەکەی چەقۆ و چەکی بانك و نەخشەی کتێب کە ژمارە تەلەفۆنی (محمد عبدی) لەسەر نووسرابوو کە دواتر لە ڤێرجینیا گیرا، دۆزرایەوە.

٥-سالم الحازمی: تەمەنی ٢٠ ساڵ، لەوانەیە ئەم ناوەش دزراو بێت و ڕاستەقینە نەبێ.

## و - ئەوانەی لە رفاندنی ئەو فڕۆکەیەی کە لە گوندێکی (بنسلڤانیا) کەوتە خوارەوە تۆمەتبارن:

١- سعيد الغامدی: یەکێکە لەو سێ ڕفێنەرانەی کە تۆمەتبارە بە هەبوونی پەیوەندی بە ڕێکخستنی قاعیدە، لە فلۆریدا وانەی فڕۆکەوانی وەرگرتووە، لە بارەی ساڵی لە دایکبوون و ڕەگەزنامەکەی زانیاری لە بەردەست نییە. زۆر نازناوی بەکارهێناوە، تۆماری پەناهەندە ئاماژە بەوە دەکات کە الغامدی زۆر جار بۆ فلیپین سەفەری کردووە، ڕۆژنامەی شەرق ئەوسەت دەڵێت: غامدی ناسنامەی خزمێکی فڕۆکەوانی سعودی بردووە، کاتێ وێنە و ناوی لە شاشەی تەلەفزیۆن دەبینێ تووشی داخورپان دەبێ.

٢- احمد ابراهيم الحزناوی: ٢١ ساڵ، سعودیە و لە فلۆریدا ژیاوە، سەرچاوەکان دەڵێن کوڕی پێشنوێژی یەکێك لە مزگەوتەکانی شاری (بلطورشية).

٣- احمد النامی: تەمەن و ڕەگەزنامەی دیارنییە، لە فۆریدا دانیشتووە، زۆر نازناوی بەکارهێناوە.

٤- زیاد سمیر جرار: لوبنانییە، لەفلۆریدا و هامبۆرگی ئەڵمانی ژیاوە، هەر لە فلۆریدا وانەی فڕۆکەوانی وەرگرتووە، ناویشی لە تۆماری سەندیکای فڕۆکەوانی لە هامبۆرگ نووسراوە، باوەڕ دەکرێت یەکێك بێ لە ئەندامانی شانەی تیرۆرستی هامبۆرگ کە (محمد عەتا و مروان الشیهی)ی لە خۆگرتبوو، پۆلیسی ئەڵمانی چەند بەڵگەیەکی لە شوقەی برادەرێکی (جرار) دۆزیوەتەوە، دوای چەند ڕۆژێك لە کارەساتەکە.

لەناو ئەو ناوانە (محمد عەتا) کە بە سەرۆکی ئەو شانەیە ناسراوە هێرشەکانی ئەنجامداوە، هەندێ پێی دەڵێن سەرۆکی شانەی فڕۆکە ڕفێندراوەکان، بە ڕەگەز میسرییە سەر بە جیهادی ئیسلامی میسری بووە، ئەم ڕێکخراوەش پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ ڕێکخراوی قاعیدە هەبووە، یەکێکە لەو پارت و ڕێکخراوە ئیسلامییانەی کە (بەرەی جیهادی ئیسلامی دژ بە ئەمریکییەکانیان) پێکهێناوە، هەروەها سێ لەوانە، کەسێکە ڕۆڵێکی گرنگی لە تەقاندنەوەی هەردوو باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە (تەنزانیا و کینیا)و تەقاندنەوەی کەشتیگەلی تێکشکێنەری کول (المدمرە کول) لەکەنداوی عەدەن، بینیووە.

ڕووداوی ١١ی سێپتێمبەر، کاریگەری ئەوەندە زۆر بوو لەسەر ئەمریکا، کە وای کرد، ئەمریکا سیاسەتەکانی خۆی لەبەرانبەر جیهان بەگشتی و جیهانی ئیسلامی بەتایبەتی و گروپ و ڕەوتە ئیسلامییەکان بەتایبەتی تر، بگۆڕێ. ١١ی سێپتێمبەر ئەمریکای لە بەرانبەر هەڕەشەیەکی دیکە، بەخەبەر هێنا کە تا ڕوودانی ڕووداوەکەش دەرکی پێ نەدەکرا، ئەگەر پێش ئەو ڕووداوە شەڕی ئەمریکا لە دەرەوەی سنوورەکانی حسابی بۆ دەکرا، ئەوا دوای ڕووداوەکانی ١١ی سێپتێمبەر شەڕ هاتە بەردەرگا، دوای ئەو ڕووداوە ئەمریکا (هاوپەیمانێتی دژ بە تیرۆری لە بەرانبەر بەرەی جیهادی جیهانی) دروستکرد و کەوتە خۆ بۆ کۆکردنەوەی دۆست و لایەنگر بۆ ئەو هاوپەیمانێتیە.

# بەشی حەوتەم

## ئەفغانە عەرەبەکان و توندوتیژیی سیاسی لە کوردستان

هەروەك لە کوردستان باوە، شکستە سیاسی و سەربازییەکانی کورد، هەندێك جاریش سەرکەوتنەکان، دیاردەی سیاسیی تازەیان بەدوای خۆیاندا هێناوە.

نسکۆی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٧٥، یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان دادەمەزرێنێ. پاشەکشەی بزووتنەوەی چەکداری کورد لە بەرانبەر هێزەکانی ڕژێمی بەعس لە ساڵی ١٩٨٨ و کارەساتی هەڵەبجە (بزووتنەوەی ئیسلامی لەکوردستان)ی هێنایە وجود، سەرکەوتنی ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١، (یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان)ی لێکەتەوە.

ئامادەبوونی ڕەوتی ئیسلامی لە کوردستان، بەهۆی زاڵبوونی کێشەی نەتەوایەتی و مەسەلەی ڕزگاری نیشتیمانی، هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عێراقەوە، ئامادەبوونێکی سیاسی و تەنزیمی نەبووە، بەڵام لە شێوەی کەسایەتی تاك و تەرا لێرە و لەوێ، کاریگەر بە بیروڕاکانی (ئیخوان مسلمین) ئامادەبوونی هەبووە، هەر ئەمانەش بوون لە ساڵی ١٩٨٨دا بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراقیان بەسەرۆکایەتی (شێخ عوسمانی کوڕی شێخ عەبدولعەزیز) دامەزراند. ئەم بزووتنەوەیەش جیهادکردن لە بەرنامەیدا بوو، بەڵام بیرە جیهادییەکەی، لە بیری جیهادی ئیخوانەکان نزیك بووە، لە ساڵی ١٩٩٢ کۆمەڵی ڕاپەڕین (جماعة النهضة) دروست بوو، لە ساڵی ١٩٩٤ یەکگرتووی ئیسلامی لە کوردستان، لەلایەن ئیخوانە میانڕەوەکانی کوردستانەوە دامەزرا.

یەکگرتووی ئیسلامی هەر لە سەرەتای دروستبوونیەوە، پشتی لە کاری جیهادی (واتا شەڕکردن بە چەك) کرد و چالاکییەکانی لە مەسەلەی سیاسی و بواری بانگەشەکردن چڕکردەوە. لە سالّی ۱۹۹۹ بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان وکۆمەلّی نەهزە بڕیاریاندا لە ژێرناوی (بزووتنەوەی یەکبوون) یەکبگرن، بەلاّم ئەم یەکگرتنەیان لەبەر جیاوازی بیروڕا زۆری نەخایاند، (بزووتنەوەی یەکبوون) بۆ سێ گروپی دیکە دابەش بوو، ئەوانیش:

کۆمەلّی ئیسلامی بە سەرۆکایەتی عەلی باپیر و، بزووتنەوەی ئیسلامی بە سەرۆکایەتی مەلا عەلی عەبدولعەزیز و کۆمەلّی (جند الاسلام) بە سەرۆکایەتی (ئەبو عەبدوللاّ شافعی).

جوندلئیسلام (جند الاسلام) پێش ڕاگەیاندنی لە دوو کۆمەلّی بچوکتر (جماعة الجهاد و جماعة التوحید) پێکهاتبوو، کە لە سالّی ۲۰۰۱ خۆیان ڕاگەیاند، ئەمانە لە چەند کادیرێکی بە ئەزموون، لەوانەی بەشداری شەڕی ئەفغانیان کردبوو، پێکهاتبوو. هەر ئەو کۆمەلّە (جند الاسلام) دواتر ناوەکەی بۆ (انصار الاسلام) گۆڕا، سەرەتا ئەم کۆمەلّەیە لەسەر سنوورەکانی ئێران — عێراق لە گوندەکانی تەوێلّە و بیارە و ناوچەکانی دەوروبەری هەلّەبجە دەسەلاّتیان دەڕۆیشت، ئەم کۆمەلّەیە لە ۲۰۰۱/۹/۱۰ خۆی ڕاگەیاند، مەلا کرێکار (نجم الدین فەرەج) و ابو عەبدوللاّی شافعی (وریا هەولێری) لە دیارترین سەرکردەکانی ئەم کۆمەلّەیە بوون[1]. وریا هەولێری (ابو عەبدوللاّ شافعی) سەرکردەی سەربازیی (انصار الاسلام) بوو، لە سەرەتای سالّی ۲۰۰۱ لە کۆمەلّی ئیسلامی لە کوردستان لەگەلّ (۳۰۰) چەکداری دیکەی ئەفغانی عەرەب و کورد، جیابوونەوە، ئەو (۳۰۰)کەسە لەوانە بوون کە مەشقی سەربازییان لە سەربازگەکانی ئەفغانستان بینیبوو. ئەمانە لە ڕێگەی ئێرانەوە لە ئەفغانستانەوە بەرەو کوردستان گەڕانەوە.

---

[1] الحرکات الاسلامیة الجهادیة، هانی السباعی، شبکة البصرة.

لەو دکۆمێنتانەی دوای هێرشەکانی ئەمریکا بۆ سەر ناوچەکانیان دەستکەوتووە، دەرکەوتووە ئوسامە بن لادن بە بۆنەی دامەزراندنی ڕێکخراوەکەیان، نامەیەکی پیرۆزبایی و بڕی (٣٠٠) هەزار دۆلاری بۆ ناردوون، بۆ ئەوەی کۆنگرەی یەکەمی پێ ببەستن.

هەروەها لەو دیکۆمێنتانە دەرکەتووە کە (ئەبو عەبدوڵڵا شافعی) بەماوەیەکی کەم پێش ڕووخانی ڕژێمی تالیبان لە ئەفغانستان مەشقی لە سەربازگەکانی بن لادن بینیووە. وریا هەولێری لە کۆنگرەی یەکەمدا سەرکەوتوو دەبێ لە ڕازیکردنی گروپەکەی مەلا ئاسۆ کە بێتە ناو کۆمەڵەکەیەوە، مەلا ئاسۆ کە بڕوانامەی لە جیۆلۆجیا هەیە، لە بزووتنەوەی ئیسلامی جیادەبێتەوە و هێزی سۆران دادەبڕێنێ، ئەو هێزە بەشی زۆری باڵی چەکداری بزووتنەوەی پێکدەهێنا.

کۆمەڵی (انصار الاسلام) لەو ناوچانەی ژێر دەسەڵاتیان، دەستیان بەجێبەجێکردنی هەندێ شەعائیری ئیسلامی وەك ڕووپۆشی ئافرەتان و داخستنی دوکانەکان لە کاتی نوێژکردن و قەدەغەکردنی گۆرانی و مۆسیقا و مەیخواردنەوە کرد.

سەرچاوەکانی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان دەڵێن، ئەوکات نزیکەی (٨٠) ئەفغانی بە ڕەگەز (مەغریبی و سوری و ئوردنی و فەلەستینی و میسری)یان لە ناودا هەبووە، لەپاڵ (٦٠) ئەفغانی عێراقی کە لە سەربازگەکانی ئەفغانستان مەشقیان بینیوو[١].

---

[1] انصار الاسلام فی تورابورا العراقیة، احمد فهمی، البیان الاماراتی، الجزء الاول من المقال.

## تیڕوانینەکانی انصار الاسلام:

کۆمەڵی (انصار الاسلام) بیری سەلەفی سوننی جیهادی هاوشێوەی سەلەفی سعودی لە ڕووی زانستییەوە، هاوشێوەی (جیهادی میسری) لە ڕووی پراکتیکیەوە، هەڵگرتووە.

دەکرێت پەیوەندی ئەنسارولئیسلام بە یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان بۆ (٣) قۆناغ دابەش بکەین:

**–قۆناغی یەکەم، لە مانگی ٩ی ساڵی ٢٠٠١ ەوە تاکو ٢٠٠١/١٢/١١**

ئەو سەردەمەیە (جند الاسلام) لایەنێکی سەرەکی ناو (انصار الاسلام) بوو، باوەڕی وابوو، کە دەبێت جیهاد لە دژی پارتە کوردییە عەلمانییە کافرە لە دین دەرچووەکان، ڕابگەیەنرێت، لەو سەردەمەدا (ئەبو عەبدوڵڵا شافعی) سەرکردایەتی (جند الاسلام) ی دەکرد، لەم قۆناغەدا شەڕی زۆر گەرم لە نێوان هێزەکانی (ی.ن.ك) و (جندالاسلام) بەرپابوو، بەڕای ئیسلامییەکان، یەکێتیی لە ماوەی (٧٣) ڕۆژدا (١٠٨٦) پێشمەرگەی کوژارن و بریندراربوون، لە بەرانبەردا جند الاسلام تەنها (٤٧)کوژراوی دا، ئەمەش لەبەر ئەوەی جند الاسلام پەیڕەوی شەڕی پارتیزانی دەکرد، بەڵام ئەو زیانانەی یەکێتیی وایان نەکرد دەسەڵاتی ئیسلامی فراوانتر بێت. دوای ڕووداوەکانی ١١ی سێپتێمبەر، یەکێتیی نیشتیمانی دەستی بە ڕێکخستنی هەڵمەتێکی بەربڵاوی ڕاگەیاندن لە دژی (جند الاسلام) کرد، بە پاشکۆی بن لادن لە قەڵەمی دا چ لە ڕووی ڕێکخستنەوە بێت یا لە ڕووی داراییەوە، هەروەها بڵاویکردەوە کە سەدان ئەفغانی عەرەب لە ریزەکانی ئەو کۆمەڵەیەدا هەن، ئەو کۆمەڵەیە شێوە ژیانێك دەسەپێنن کە لە شێوە ژیانی بزووتنەوەی تالیبان نزیکە.

یەکێتیی چەند تاوانێکی دایە پاڵ جند الاسلام، کە گرنگترینیان ئەو بۆسەیە بوو، کە جند الاسلام بۆ پێشمەرگەکانی یەکێتیی لە ناوچەی (خێڵی حەمە) لە سەر ڕێگای هەڵەبجە – سلێمانی نایەوە، لە ئەنجامدا (٣٧) پێشمەرگەی یەکێتیی دەکوژرێن و لاشەکانیان دەشێوێنرێت، وێنەی ئەو لاشە شێوێنراوانە دەدرێن بە

ڕۆژنامەکانیش وەك بەڵگەیەك لە سەر توندوتیژی بزووتنەوەی جند الاسلام، جند الاسلام لە لای خۆیەوە ئەو تۆمەتانەی (ی.ن.ك) ڕەتکردەوە. دوای ئەمە شەڕ لە نێوان هەردوولادا لە ١١ی ئۆکتۆبەر دەوەستێ، ئەمەش دوای ئەوەی هێزەکانی یەکێتیی چەند سەرکەوتنێك لە دەوروبەری هەڵەبجە بەدەستدێنن.

**-قۆناغی دووەم، لە ٢٠٠١/١٢/١١ ەوە، بە ڕۆژێك دوای ڕاگەیاندنی (انصار الاسلام) دەست پێدەکات**

کاتێ (انصار الاسلام) لە یەکگرتنی هەر سێ ڕێکخراوەکانی (جند الاسلام + حماس + حرکە التوحید) دێتە دامەزراندن. مەلا کرێکاری سەرۆکی ئەنسار ئارەزووی دەکرد شەڕ لەگەڵ یەکێتیی بوەستێنێ، بۆیە دوای ئەم ڕاگەیاندنە، یەکسەر شەڕی وەستاند و هەردوولا چوونە نێو گفتوگۆکردن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان، انصار الاسلام- یش هەندێ لە پرۆگرامەکانی خۆی گۆڕی، ژمارەیەك دیدار و چاوپێکەوتن لە نێوان هەردوولادا ڕوویدا، سەرەڕای ئەو زیانە گەورانەی بەر یەکێتیی کەوتبوون، یەکێتی لە سەرەتادا هەندێ نەرمی نواند، بۆیە لە یەکێك لە هۆتێلەکانی شاری سلێمانی زۆربەی سەرانی (انصار الاسلام)ی بۆ نانخواردن داوەت کرد، مەلا کرێکار و ایوب ناوێك وەك نوێنەری (ئەبو عەبدوڵڵای شافعی) و محمد حەسەن وەیس، ئامادەی ئەو خوانە ببوون.

داواکارییەکانی ئەنسار لە یەکێتیی ئەمانە بوون:

١- بەڕێوەبردنی شارۆچکەی تەوێڵە و بیارە بەوان بسپێردرێت.
٢- یەکێتیی زەرەرو زیانەکانی شەڕیان بۆ ببژێرێتەوە.
٣- یەکێتیی مانگانەیەکی دارایی وەك سەرجەم حزبە کوردییەکانی دیکە بۆ ئەنسار ببڕێتەوە.

گفتوگۆکانی نێوان هەردوولا بەردەوام بوو، تا ئەو کاتەی کە هەوڵی تیرۆرکردنی دکتۆر بەرهەم ساڵح (سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران — ئیدارەی سلێمانی) درا، لەمە بەدواوە گفتوگۆکان پچڕان، چونکە یەکێتیی کۆمەڵی ئەنساری بە تێوەگلان، لەم کردەیە تاوانبار کرد.

### قۆناغی سێیەم، لە ٢٠٠٢/٤/٢ ەوە دەست پێدەکات

ئەو مێژووەی کە هەوڵە سەرنەکەوتووەکەی تیرۆرکردنی د.بەرهەم ساڵح درا، ئەو پیاوە بە دووەم کەسی ناو (ی.ن.ك) دەژمێردرێت، ئەوکات سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان (ئیدارەی سلێمانی) بوو، بەرهەم ساڵح بەنەزەری ئیسلامییەکان بە بەچکەی ئەمریکا دادەنرا و دژایەتی سەرسەختی ڕەوتە ئیسلامییەکان دەکات و خاوەن ڕەگەزنامەی ئەمریکییە و پێشیان وایە پەیوەندی بە دەزگای هەواڵگری ئەمریکییەوە زۆرە.

هەرچەندە (الانصار الاسلام) لە بەیانێکدا خۆی لەم ڕووداوە بێبەری کرد، بەڵام لێکۆڵینەوەکان دەریانخست کە سێ کەس بەکردەوەکە هەڵساون، یەکێکیان (عبدالسلام ئەبوبکر)ی ئەندامی مەڵبەندی سلێمانیی کۆمەڵی ئیسلامی، یەکێکی تریان بە ناوی (قەیس) کە سەرەتا توانی ڕابکات، بەڵام دواتر توانرا لە ماڵی یەکێ لە ئەندامانی کۆمەڵی ئیسلامی دەستگیر بکرێت. سێیەمیش ناوی (کامەران مۆریاسی) بوو، کە ئەندامێکی کۆنی کۆمەڵی تەوحید (الجماعه التوحید) بوو.

لە بەرانبەریشدا (یەکێتیی) هەڵمەتێکی فراوانی گرتنی ئەندامانی ئەو ڕێکخراوەی لە شاری سلێمانی و دەوروبەری بەڕێخست کە ژمارەیەکیشیان ئافرەت بوون، (انصار الاسلام) هەڕەشەی لە یەکێتیی کرد، کە تاکو (٣) ڕۆژ گیراوەکان بە تایبەت ئافرەتان دەبێت ئازاد بکات، بزووتنەوەی ئیسلامی بەتایبەت شەخسی (مەلا عەلی عەبدولعەزیز) نێوبژی لە نێوان هەردوو لا کرد،

چاوپێکەوتن بۆ ماوەی دوو ڕۆژ لە نێوان هەردوولادا ئەنجامدرا. ئەمەش وایکرد ئافرەتە گیراوەکان ئازاد بکرێن، بەڵام ڕەوشی سیاسیی کوردستان و عێراق بەرەو ئاراستەی دژە تیرۆر دەچوو، یەکێتیی سوودی لە هاوپەیمانێتی لە دژی تیرۆر وەرگرت و چووە پاڵ ئەمریکاوە، دووبارە شەڕ لەنێوان هەردوولا ڕوویدایەوە، بەڵام ئەمجارەیان هێزەکانی ئەمریکاش هاتنە ناو شەڕەکەوە، بۆیە لە ماوەیەکی کەمدا، یەکێتیی دەسەڵاتی بەسەر ئەو ناوچانەی کە پێشتر لە ژێر دەسەڵاتی (انصار الاسلام) دابوون، کێشایەوە.

هەرچی پەیوەندی (جند الاسلام)ە بە پارتی دیموکراتی کوردستان (PDK) ئەویش زۆر خراپ بوو، بەتایبەتی کاتێ ئەو گروپە لە شوباتی ٢٠٠٠ دا فەرەنسۆ هەریری ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی و پارێزگاری ئەوسای هەولێریان تیرۆرکرد.

## پەیوەندی انصار الاسلام بە قاعیدەوە

مەلا کرێکار لەکتێبێکی خۆیدا (الملا کریکار من خلال اقواله) کە بە زمانی نەوریجی، بڵاوکرایەوە، لەوێدا بە درێژی باسی ژیانی شەخسی خۆی دەکات کە چۆن لە قوتابییەکی سەرکێشەوە بۆ یانەی شەوان و سەرۆك تیمی فوتبۆڵێن دەگۆڕێت بۆ سەرۆکی کۆمەڵەیەکی ئیسلامی وا کە هەڕەشە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دروست بکات[1].

هەر لەو کتێبەدا باسی خولیا و لایەنی سیاسی خۆی دەکات کە بۆ یەکەمجار لە ڕێکخستنە مارکسی و نەتەوەییەکان کاری کردووە و وازی لە نوێژکردن هێناوە، بەڵام دوای نسکۆی شۆڕشی کورد، مەلا کرێکار لە ساڵی ١٩٧٥ لە هەولێر

---

[1] هەمان سەرچاوە.

دادەنیشێ، لەم ماوەیەدا قۆناغی بیری ئیسلامی دەست پێدەکات و گرنگی بە خوێندنی دیراساتی ئیسلامی و زمانی عەرەبی دەدات.

لە ساڵی ١٩٨٢-١٩٨٤ بۆ ئێران دەچێ، هەوڵدەدات کۆمەڵناسی لە زانکۆی تاران بخوێنێ، بەڵام لەم هەوڵەدا سەرناکەوێت، بۆ ئەوەی کاتی لەبەر دەست دابێ بۆ خوێندنی زانستی شەرعی لەلای زانا ئیسلامییە سونییەکان وەك پێشنوێژ (امام مسجد) سەرقاڵ دەبێت.

لە ساڵی ١٩٨٥ بەمەبەستی خوێندن بۆ پاکستان دەچێ، ئێرانییەکان یارمەتی مەلا کرێکاریان داوە ڕێکخراوێکی جیهادی دژ بە ڕژێمی سەددام حسێن دابمەزرێنێ، بۆ بەدیهێنانی ئەمە بە نهێنی (بزووتنەوەی ئیسلامی جیهادی) دادەمەزرێنێ، بەڵام ئەو بزووتنەوەیە زوو هەڵدەوەشێتەوە، چونکە مەلا کرێکار و هاوەڵانی ڕازی نابن، بزووتنەوەکە بکەوێتە ژێر کاریگەری بیری شیعی، بۆیە حکوومەتی ئێران زیاتر لە (٤٠) ئەندامیان بە تۆمەتی هەوڵدان بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی ئیسلامی سەر بە ڕەوتی ئیخوان، لێ دەستگیردەکات.

مەلا کرێکار بۆ خێوەتگای پەنابەرانی عێراق لە دەوروبەری تاران دەچێ لەوێ بەکاری مامۆستایەتی و پێشنوێژی خەریك دەبێ، لە ساڵی ١٩٨٣ بەنهێنی بۆ کوردستان دەگەڕێتەوە، (ڕووخۆش) ماردەکات و دووبارە دەچێتەوە ئێران و لەوێشەوە بۆ پاکستان، لە پاکستان لە ساڵی ١٩٨٤ بۆ ماوەی (١٠٠) ڕۆژ دەستگیر دەکرێت، دوای ئازادکردنی لە (کەراچی) تا ڕوودانی کارەساتی هەڵەبجە دەمێنێتەوە. لە کەراچی بەکاری مامۆستایەتی خەریك دەبێت و لە ساڵی ١٩٨٨ سەردانی پیشاوەری سەرسنووری ئەفغانستان – پاکستانی کردووە[1].

دوای ساڵی ١٩٨٨ کرێکار دەچێتە هۆڵندا و دواتر لە ساڵی ١٩٩١ ەوە مافی پەناهەندەی سیاسی لە نەرویج وەردەگرێت.

---

[1] جريدة الشرق الاوسط، العدد، ٩٢٧٧، سنة ٢٠٠٤.

مەلا كرێكار لە پێشەوەی ئەو ئیسلامییە كوردانە دێت كە لە خەباتی ئەفغانی نزیك بووە، كەوتۆتە ژێر كاریگەری نووسینەكانی سید قطب و عبدالله عزام و الشیخ عبدالمجید الزندانی وەك خۆی دەڵێت.

دەزگای هەواڵگری ئەمریكی (الانصار الاسلام) بە بازنەیەكی بزربووی نێوان قاعیدە و ڕژێمی سەدام دادەنێت، بۆیە زۆر گرنگی بەچالاكی و جموجوڵی ئەو كۆمەڵەیە دەدا.

ئەو كۆمەڵەیە هەر وەك (بەرەی ئیسلامی جیهانی) لە بەیاننامەی دامەزراندنەكەی بەڵێنی دابوو كە یەهودییەكان و مەسیحییەكان لە كوردستان وەدەربنێ و لەسەر ڕێبازی جیهادكردن بەردەوام بێت تاكو شەرعیەتی ئیسلامی لە هەموو ناوچەكان دەچەسپێنێ. ڕۆژنامەی (لۆس ئەنجلەس)یش ئەو ڕایەی پشتڕاست كردۆتەوە كاتێ چاوپێكەوتنی لەگەڵ یەكێ لە گیراوەكانی ئەو كۆمەڵەیە سازداوە، بۆی دەركەوت كە سەرانی ئەو كۆمەڵەیە لە ساڵی ٢٠٠٠ كەسێكیان بە ناوێكی خوازراو (مەلا نەعمۆ) لەگەڵ دوو پاسەوانی تایبەت بۆ ئێران و لەوێشەوە بۆ سەربازگەكانی بن لادن ناردووە، كاتێ (مەلا نەعمۆ) دەگەڕێتەوە نامەیەكی بن لادنی لا دەبێ و تێیدا داوا لە گروپە ئیسلامییەكانی كوردستان دەكات كە یەكبگرن. لە دوای ئەمە سەركردەیەكی دیاری قاعیدە دێتە كوردستان و هەوڵی دامەزراندنی سەربازگە و مەشقی سەربازی و فێربوونی تەقینەوە دەدات[1].

بەگوێرەی زانیاریەكانی (CIA) ئەم كۆمەڵەیە یارمەتی دارایی بەبڕی (٣٠٠-٦٠٠) هەزار دۆلاری لە قاعیدە وەرگرتووە، ئەم داراییەشیان لە ئەندامێكی دیاری قاعیدە بە ناوی (ئەبو قتادە) لە لەندەن وەرگرتووە[2].

---

1 جريدة الشرق الاوسط، العدد، ٨٨٥١، سنة ٢٠٠٣.

2 منتدى الشرق الاوسط، انصار الاسلام فی العراق تالیف جوناتا شانزر.

گرتنی (بدرالدين عباد اسيد) له سلێمانی، پەیوەندی ئەنسار بە قاعیدە بەهێزدەکات، بدرالدين عباد اسيد کە لە ناو کۆمەڵی ئەنسار بوو لەکاتی دەستگیرکردنی وێنەی ئوسامە بن لادن و کاسێتی ڤیدیۆیی و ئەدەبیاتی (الجماعة السلفية للدعوة والقتال)ی لە لابووە[1].

لە ٢٧ی مارسی ٢٠٠٢ سەرکردایەتی ئەنسار سەرقاڵی دانانی سەرۆکێکی تازە بوو لە شوێنی (سعدون محمود عبداللطيف) کە بە (ئەبو وائل) ناسرابوو، چونکە دەیویست کوردستان بەجێبهێڵێت و بۆ نیویۆرك بچێت، ئەبو وائل بەرپرسی دەستەی دەرکردنی فەتوا بوو لە سەر ئاستی کوردستان، هەر لە هەمان ڕێکەوت کۆمەڵێ (ئەفغانی عەرەب) لە سەر سنووری ئێران — عێراق لەلایەن دەسەڵاتدارانی کوردەوە دەستگیر دەکرێت، ئەوانە دوای لێکۆڵینەوە دان بەوە دادەنێن کە بەچاوساغی (انصار الاسلام) لە ئێرانەوە بۆ عێراق هاتوون[2].

لە ساڵی ٢٠٠٣، (سهيل بن جاسم السهلی) ناسراو بە (ياسين البحر) سەرکردەی ئەفغانە عەرەبەکان لە کوردستان کوژرا. ناوبراو بەشداری شەڕی لە تاجیکستان و بۆسنە و شیشان و کوردستان کردووە[3].

بەگوێرەی هەندێ سەرچاوە ژمارەی ئەو ئەفغانە عەرەبانەی کە دوای شەڕی ئەمریکا بۆ سەر عێراق لە کوردستان ئامادەبوون، دەگەیشتە نزیکەی (٦٠٠ - ٧٠٠) چەکدار، ئەوانە دوای لێدانی ئەمریکی بۆ بەغدا و شارەکانی دیکەی عێراق پەرتەوازەو پاشەکشەیان کرد[4].

دوای ئەوەی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان ڕایگەیاند کە پرۆسەی ڕاوەدونان و گرتنی کۆمەڵی (انصار الاسلام) کۆتایی هات، دیلێکی عەرەب کە بۆ

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٧٣٠، سنة ٢٠٠٢.

[3] سایتی هەڵەبجە، ڕێکەوتی ٢٠٠٢/٣/٢٧.

[4] جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٩٠٢، سنة ٢٠٠٣.

جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٩٠٠، سنة ٢٠٠٣.

جريدة الشرق الاوسط، العدد ٨٨٨٩، سنة ٢٠٠٣.

کوردستانی نویٚ قسەی کردبوو، دانی بەوەنابوو کە پێش شەش مانگ پەیوەندی بەگروپی ئەنسارەوە کردووە لە بەغدادوە بۆ کوردستان هاتووە، ئەم دیلە کە ناوی (احمد محمود عبدالرحمان الطویل) بوو لە دایکبووی ساڵی ١٩٦٦ەوە خاوەنی رەگەزنامەی فەلەستینییە، دانی بەوەناوە کە یارمەتی لە ژمارەیەك (ئەفغانی عەرەب)ی سوری پێگەیشتووە، کە پێش دووساڵ پەیوەندییان بە (انصار الاسلام)ەوە کردبوو[1].

لە ژمارە (٩٢٧٧)ی رۆژنامەی شەرق ئەلئەوسەت هەواڵی (حیدر الشمری) ئەفسەری هەواڵگری پێشووی عێراق کە بۆ ماوەیەك وەك رێکخەری نێوان رژێمی سەددام و گروپی ئەنسار کاریکردووە، بڵاوکراوەتەوە.

شەمەری کە لە ئاسایشی سلێمانی دەستبەسەرکراوە دەڵێت: (ئەنسار رێکخستنێکە لە بنەڕەتدا وەك لقێکی رێکخستنی قاعیدە لە کوردستان دامەزراوە و پەیوەندی بەتینی بە دەزگا هەواڵگرییەکانی سەدامەوە هەبووە) هەروەها دەڵێت: (دەزگای هەواڵگری عێراقی یارمەتی گروپی ئەنساری داوە بۆ کردنەوەی سەربازگە و فێرکردنی ئەندامانی ئەو گروپە لە سەر (ڕفاندن، تەقینەوە، خۆکوژی) بەرپرسی یەکەمی ئەوکارە لە ئەستۆی (العقید سعدون العانی) ناسراو بە (ئەبو وائل) بوو[2].

لەوانەیە ڕاگەیاندنەکەی کوڕی (عەبدوڵڵا عەزام)ی ڕێبەری ڕوحی ئەفغانە عەرەبەکان (حذیفە عبداللە عزام) باشترین نمونەی پەیوەندی ئەنسار و قاعیدە لە لایەك و ڕژێمی عیراقی لە لایەکی دیکەوە ڕوون بکاتەوە.

حوزەیفە لە پەیوەندییەکی لەگەڵ ڕۆژنامەیەکی فەرەنسی دەڵێت: (ڕژێمی سەدام پێشوازی لەو ئەفغانە عەرەبانە دەکرد کە بەمەبەستی شەڕکردن دژی ئەمریکا دەهاتنە ناو عێراق، بەڵام مەسەلەی هاتن زەحمەت بوو، چونکە وڵاتانی دراوسێی

---

[1] جریدة الشرق الاوسط، العدد ٩٢٧٧، سنة ٢٠٠٤.

[2] جریدة الشرق الاوسط، العدد ٩٤٠٧، سنة ٢٠٠٤.

عێراق سنوورەکانیان توندوتۆڵ کردبوو، بەڵام ئێمە (مەبەستی ئەفغانە عەرەبەکانە) هەر لە کۆتایی ساڵی ۲۰۰۱ ەوە لە ڕێگەی چەکدارە کوردەکان (مەبەستی جند الاسلام و انصار الاسلام)ەوە، ئەوانەی لە گۆڕەپانی شەڕی ئەفغانی بەشداریان کردبوو، دەهاتینە ناو عێراق)[1].

## گرنگترین چالاکییە توندوتیژیەکانیان:

١- لە ۲۰۰۲/۹/۲۲ کۆمەڵی (جند الاسلام)، (ڕێبوار سەید عومەر)یان لە عەیادەکەی لە هەڵەبجە ڕفاند، لە بیارە بۆ ماوەی (۲۰) ڕۆژ بەندیان کرد.

٢- لە ۲۰۰۲/۹/۲۳ لە بۆسەیەکدا (۳۷) پێشمەرگەی (ی.ن.ک)یان کوشت ئەم کردەوەیە لە ناوچەی (خێڵی حەمە) لە سەر ڕێگای سلێمانی – هەڵەبجە ڕوویدا، یەکێتیی وێنەی کوژراوەکانی لە TV پیشاندا کە هەندێکیشیان سەریان هەندێکی دیکەشیان ملیان بڕابوو.

٣- تیرۆر کردنی (فەرەنسۆ هەریری) لە شاری هەولێر لە شوباتی ۲۰۰۰.

٤- لە ۲۰۰۳/۳/۲۲ دا ئەبو الحور (سعودی) بەهۆی ئۆتۆمبێلێکی مینڕێژکراو خۆی تەقاندەوە و لە ئەنجامدا ڕۆژنامەنووسێکی ئوسترالی و سێ پێشمەرگەی پاسەوانی کوژران.

٥- لە ۲۰۰۳/۲/۹ شەوکەتی حاجی مشیر ئەندامی سەرکردایەتی (ی.ن.ک) و دوو پاسەوانی تایبەت لە گوندی (گامێش تەپە) تیرۆرکرد.

٦- هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ژەهری (گازی دەمار VX) و تاقیکردنەوەی لە سەر هەندێ ئاژەڵ لە کوردستان.

---

[1] القاعدة فی السعودیة من التشکیك الی العزل، الاستاذ سعود بن صالح السرمان، جریدة الشرق الاوسط ۲۰۰۵/۵/۲۳.

٧- هەوڵە سەرنەکەوتووەکەی تیرۆرکردنی بەرهەم ساڵح سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان - ئیدارەی سلێمانی.

٨- لە ١ی شوبات ٢٠٠٤ کردە خۆکوژییەکەی شاری هەولێریان لە هەردوو بارەگا (لقی دوو و مەڵبەندی سێ) هەردوو پارتە سەرەکییەکەی کوردستاندا ئەنجامدا، کە سەدان کەس بوونە قوربانی.

٩- لە ساڵی ٢٠٠٣ تەقاندنەوەی بارەگایەکی هێزەکانی ئەمریکا لە گەڕەکی شۆڕش لە شاری هەولێر.

١٠- تەقینەوەکەی بەردەم وەزارەتی ناوەخۆی حکوومەتی هەرێم - ئیدارەی هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٣.

١١- دووجار هەوڵیاندا پارێزگاری دهۆك (نێچیرڤان احمد) لە ٢٠٠٤/٩/١٩ و ٢٠٠٤/١٢/٤ تیرۆر بکەن.

١٢- هەوڵی تیرۆرکردنی (محمود محمد)ی بەرپرسی لقی دووی پارتی دیموکراتی کوردستانیان لە هاوینی ٢٠٠٤ دا.

١٣- هەوڵی تیرۆرکردنی (کاکەمین نەجار)ی بەرپرسی لقی (١٦) پارتی لە ٢٠٠٤/١٢/١٢ دا.

# بەشی هەشتەم

## ئەفغانە عەرەبەکان و توندوتیژی سیاسی لە عێراق

لەوانەیە ئەمە جێی پرسیار بێت، کە بۆچی ئەفغانی کوردی پێش ئەفغانی عەرەبی عێراقی کەوتبێ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە، چونکە کوردستان پێشینەی لە دروستبوونی ئەم دیاردەیە لە چاو عێراقی عەرەبی هەیە، هەروەها کوردستان بۆتە دەروازەیەك، بۆ درووستبوونی دیاردەی ئەفغانی عەرەبی عێراق، بەڵام ئەوەی عێراق لە کوردستان و وڵاتی دیکە جودا دەکاتەوە، دیاردەی ئەفغانی عەرەب قۆناغێکی تازە و هەنگاوێکی دیکە بە خۆیەوە دەبینێ، بە تایبەتی کاتێ دیاردەکە لە ئەفغانی عەرەب بۆ چەکدارە عەرەبەکان دەگۆڕێت.

هەروەك لە بەشەکانی پێشەوە باسمان کرد، دیاردەی ئەفغانە عەرەبەکان بۆ ساڵی ١٩٨٩ کاتی جیهادی ئەفغانی دژ بە سۆفیەت کۆتایی پێهات، دەگەڕێتەوە. لە ساڵی ١٩٧٩ چەکدارە عەرەبەکان لە جیهادی ئەفغانی ناویان (جیهادکەرانی عەرەب) بوو، بە کۆتایی هاتنی جیهادەکە کتوپڕ ناوەکە بۆ ئەفغانە عەرەبەکان، (العرب الافغان) گۆڕا، کاتێ ئەوانە بۆ وڵاتەکانیان گەڕانەوە، ناویان بۆ گەڕاوەکانی ئەفغان (العائدون من الافغان)، کە گۆڕپانێکی دیکەی شەڕ (جیهاد بە قەولی ئەوان) لە عێراق کرایەوە، ئەوانەی ڕوویان لە عێراق کرد، پێیان گوترا (ئەفغانە عەرەبەکان)، بەڵام ئەوانەی لە وڵاتە عەرەبەکانەوە هاتبوون، بە وێستگەی خەباتی ئەفغانیدا تێنەپەڕیبوون دووبارە پێیان گوتراوە (شەڕکەرە عەرەبەکان)، واتە هەمان ئەو خاڵەی کە لە سەرەتای شەڕی ئەفغاندا دەستیان پێکردبوو.

بۆ ئەوەی لە ڕۆڵی ئەفغانە عەرەبەکانی عێراق بگەین، سەرەتا پێویستە ئەو جیاوازییە گەورەی وڵاتی عێراق لە چاو وڵاتانی دیکەی عەرەب کە ئەفغانە عەرەبەکان چالاکییان تێدا نواندووە، لەبەر چاو بگرین. ئەویش ئەوەیە لە سەرجەم ئەو وڵاتانەی کە پێشتر باسمان کرد، بە کوردستانیشەوە کۆمەڵە و پارتێکی نزیك یان هاوتەریب بە بیروڕاکانی ئەفغانە عەرەبەکانی تێدا هەبووە، بەڵام عێراق ئەو دیاردەیەی تێدا نەبووە، لە عێراق هیچ پارتێکی ئیسلامیی جیهادی تا دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام لە ئارادا نەبووە، بۆیە دەڵێم کوردستان لە دروستبوونی ئەم دیاردەیە دەستپێشخەر بووە، چونکە لەلایەك کەسایەتی ئەفغانی کوردی پێش ساڵانی نۆوەدەکان گۆڕەپانی شەڕەکانی ئەفغانستانیان بینیوە، لە لایەکی دیکەوە لە کوردستان پارتی ئیسلامیی سیاسیی جیهادی پێش درووستبوونی ئەم دیاردەیە هەبووە، هەر بۆیە سەیر نییە گەر بڵێین کوردستان دەروازەی هاتنە ناوەوەی ئەفغانی عەرەب بووە بۆ ناو عێراق.

کوڕی عەبدوڵا عەزام ڕێبەری ڕۆحی ئەفغانە عەرەبەکان، (حذیفة عزام) لە بارەی هاتنی ئەفغانە عەرەبەکان بۆ عێراق دەڵێت: (لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠١ لە ڕێگەی زنجیرە چیاکانەوە بە یارمەتی ئەفغانە کوردەکانی سەردەمی شەڕی ئەفغان بۆ کوردستان هاتوون، ئەمەش دوای ئەوەی دەسەڵاتدارانی عێراق لەوە دڵنیا بوون کە لەلایەن ئەمریکاوە هێرشیان دەکرێتە سەر، ڕژێمی سەددام حسێن پێشوازی لێکردین، بەڵام چاودێرییەکی توندو ڕاستەوخۆی لە سەر دانایین )[1].

کەواتە دزەکردنی ئەفغانە عەرەبەکان بۆ ناو عێراق پێش هێرشی ئەمریکی بۆ سەر عێراق دەگەڕێتەوە، بەڵام نابێ ئەوەمان لە یاد بچێ کە ئەفغانە کوردەکان یارمەتیدەر و ڕێپیشاندەریان بوونە، هەروەك باسمان کرد کە (انصار الاسلام) کوردی ڕێکخراوێکە ئەگەر ڕاستەوخۆش لەلایەن قاعیدەوە سەرپەرشتی نەکرابێت، بەڵام بەگشتی لەو چوارچێوەیە فیکری و ئایدیۆلۆژییەی کە قاعیدە کێشاویەتی دەرناچێت، ئەم بزووتنەوەیەش لەکۆتایی ساڵی ٢٠٠٠ و سەرەتای

---

[1] جریدة الشرق الاوسط، العدد ٩٤٠٧، لسنة ٢٠٠٤.

٢٠٠١ دامەزرا، کەواتە ڕێك لەگەڵ ئەو مێژووە کە (حذیفة عزام) باس لە هاتنەکەیان دەکات بۆ ناو کوردستان.

وەك ڕوونمان کردەوە لەناو ڕیزەکانی (انصار الاسلام)دا ژمارەیەکی زۆر لە ئەفغانی (مصری، ئوردنی، سعودی، جەزائیری، یەمەنی، سودانی...) هەبوون ئەمانە دوای هێرشە چڕەکانی ئەمریکا و پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك) بۆ سەر پێگەکانیان خەریکبوو بە تەواوی لەناو بچن، ئەوانەی مانەوە و ڕایان کرد بۆ ناوەڕاست، لەوێ پەیوەندیان بە(جیش انصار السنە)وە کرد.

(جیش انصار السنة) لەیەکەم بەیانیاندا کە لە (٢٠٠٣/٩/٢٠) دەرچوو، ئەبو عەبدوڵلا الحسن بن محمودیان وەك ئەمیری خۆیان ناساند، لەو بەیانەدا ئامانجی خۆیان لە دامەزراندن ڕوونکردەوە کە (کۆمەڵێکن دەیانەوێت ڕووبەڕووی ئەمریکییەکان و سەرجەم پارت و کۆمەڵە عەلمانییەکان و حکوومەتە عەلمانییەکان ببنەوە)[1].

جیش انصار السنة: کۆمەڵەیەکی ئیسلامی سەلەفیی سونییە، دوای (٥) مانگ لە داگیرکاری ئەمریکی دامەزراوە، ئەم ناوەشیان بۆیە لەخۆنا. بۆ ئەوەی لە (جیش المهدی) کە گروپەکەی موقتەدا سەدری شیعی دروستی کردبوو، جیا ببێتەوە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە ئەو کۆمەڵەیە سونییەو هیچ پەیوەندی بە شیعەوە نییە[2].

ئەم کۆمەڵەیە جیهادکردنی بە ئەرکی سەرشانی هەموو موسوڵمانێك دانا، خەڵکی سوننە و جەماعەتی تەوحید و شوێنکەوتووانی سەلەفی بە هەڵگری ئاڵای جیهاد دژبە دوژمنی کافر لە سەر زەوی موسوڵمان، دەزانێ و وەك خۆیان بەیان دەکەن فرمان و بەرنامەیان لە قورئان و سونەت وەرگرتووە.

---

1 جريدة الشرق الاوسط الصادرة في ٢٠٠٥/٥/٢٣.

2 القاعدة في السعودية من التشكيك الى العزل، تأليف سعود بن صالح الرحمان، جريدة الشرق الاوسط الصادرة في ٢٠٠٥/٥/٢٣.

ئەمانە ڕازی نین هەر تەنها هێزەکانی داگیرکەر (ئەمریکی) لە عێراق دەربچن، بەڵکو ڕازیش نابن جگە لە خۆیان کەسێکی دیکە حوکمی عێراق بکات، هەموو حوکمێك هەموو دەسەڵاتێك گەر ئیسلامی نەبێت ڕەتی دەکەنەوە.

## گرنگترین کردەوە توندوتیژەکانی ئەم گروپە لە عێراق:

١- لە ٢٠٠٣/٢/٢٣ بنکەی پۆلیسی ڕەحیماوەیان تەقاندەوە، کە ٣٠ پۆلیس کوژران و ٥٠ دیکەش بریندار بوون.
٢- تەقاندنەوەی بنکەی پۆلیسی "ثقافە" لە ٢٠٠٤/١/٣١ لە شاری موسڵ کە ١١ پۆلیس کوژران و ٥٥ دیکەش برینداربوون.
٣- لە ٢٠٠٤/١/١٥ بەگوێرەی بەیانی خۆیان لە ناوچەی یوسفیەی باشووری بەغداد توانیان لە بۆسەیەکدا (٨) ئەندامی دەزگای هەواڵگری کەنەدی و بەریتانی بکوژن.
٤- لە ٢٠٠٣/١٢/٩ لە شارۆچکەی تەلەعفەر بەسەر سەربازگەیەکی ئەمریکییان داداوە و بەگوێرەی بەیانی خۆیان ٤٠٠ سەربازیان لەو سەربازگە کوشتووە.
٥- ٢٠٠٣/١٢/٢ لە ڕۆژئاوای شاری بەغداد لە (لەتیفیە) بۆسەیەکیان بۆ دوو ئۆتۆمبێلی دەزگای هەواڵگری ئیسپانی داناوە و هەر هەشت نەفەرەکەی ناوی کوژران.
٦- لە ٢٠٠٣/١١/٢٠ ئۆتۆمبێلێکی مینرێژکراوی لەبەردەم مەڵبەندی دووی (ی.ن.ك) تەقاندەوەو ژمارەیەك کوژراو و برینداری لێکەوتەوە.
٧- ٢٠٠٣/١١/٢٤ تەقاندنەوەی باڵیۆزخانەی تورکیا لە عێراق، ئەمەش دوای ئەوەی تورکیا بەنیاز بوو هێز ڕەوانەی عێراق بکات.

دووەم ڕێکخراوی ئیسلامی کە پەیوەندی توندوتۆڵی بە قاعیدەوە لە عێراق هەیە، ئەویش (ئەبو مصعب زرقاوی)و (قاعدة الجهاد في بلاد الرافدين)ە، زەرقاوی کە ناوی ڕاستەقینەی (احمد نضال الخلالية)ە، لە ساڵی ١٩٦٦ لە ئوردن لە شاری (زەرقا)لە دایکبووە، زەرقاوی سەر بە عەشیرەتی (بنی حسن)ە کە عەشیرەتێکی دیار و بەرچاوی شانشینی ئوردنییە، لە گەڕەکێکی میللی لە شارۆچکەی (زەرقا) لە نێو خانەوادەیەکی دیندار پەروەردە بووە[1].

لەبەرئەوەی لە بواری چالاکی سیاسیی ئیسلامیدا بزێو بووە، دەسەڵاتدارانی ئەردەن چەند جارێك دەستگیریان کردووە، بەڵام لە هیچ یەکێك لەم دەستبەسەرکردنانەی تۆمەتی کاری تیرۆرستی نەدراوەتە پاڵ.

زەرقاوی لە تەمەنی لاوێتی و هەرزەکاریدا زۆر کاریگەر دەبێ بە نووسینەکانی (عەبدوڵڵا عەزام و الشيخ محمد المقديسى) کە ئەم کاریگەریەش وادەکات خۆی لە ناو ڕەوتە ئیسلامییە توندڕەوەکاندا ببینێتەوە، ساڵی ١٩٨٩ بۆ ئەفغانستان دەچێ و چاوی بە کۆمەڵێ لە سەرانی ئەفغانی عەرەب وەك ئوسامە بن لادن و محمد مکاوی (سيف العدل) دەکەوێت، پاش ماوەیەکی کەم داوا دەکات سەربازگەیەکی تایبەتی بۆ بکەنەوە، لەمەشدا سەرکەوتوو دەبێ و لە هیرات سەربازگەیەکی تایبەت بەخۆی دەکاتەوە.

لە ساڵی ١٩٩٥ بۆ ئوردن دەگەڕێتەوە (تنظيم التوحيد) دادەمەزرێنێ، کە دواتر بە (بيعة الامام) دەناسرێ، (تنظيم التوحيد) بە هاوکاری (ابى المنتصر باللة محمد) دروست دەکات، هەر لەسەر دامەزراندنی ئەم ڕێکخراوە لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەمنیی ئوردنەوە دەستگیر دەکرێت، دوای ئازادکردنی دووبارە بۆ ئەفغانستان دەگەڕێتەوە، ئەو کات ئەفغانستان لە ژێر دەسەڵاتی تاڵیباندا بوو، هەرچەندە دەسەڵاتدارانی ئوردن لەو باوەڕەدا بوون کە زەرقاوی بۆ عێراق چووبێ،

---

[1] الحركات الاسلامية الجهادية، انصار الاسلام – جيش انصار السنة- ابو معصب الزرقاوى – كتائب ابى حفص، المصدر: شبكة البصرة د. هانى السباعي.

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەفغانستانی ژێر دەسەڵاتی تالیبان باشترین شوێنی بێ مەترسی بوو بۆ ئیسلامییەکان، بۆیە ڕووی لەوێ کرد.

لە ساڵی ٢٠٠٠ زەرقاوی بە غیابیی بە (١٥) ساڵ زیندانی بە تۆمەتی دروستکردنی (تنظيم التوحيد والجهاد) حوکمدرا،کە دواتر بە کێشەی (بيعة الامام) ناسرا، دەسەڵاتدارانی ئوردەنی داوایەکی ڕەسمیان ئاراستەی حکوومەتی عێراق کرد کە زەرقاویان تەسلیم بکاتەوە، بەڵام حکوومەتی عێراقی ئەوسا گوێی بە داواکە نەدا، چونکە لە بنەڕەتدا زەرقاوی لە ئەفغانستان بوو نەوەك لە عێراق.

لە دووەم سەردانی زەرقاوی بۆ ئەفغانستان چاوی بە محمد مکاوی (سيف العدل) دەکەوێت، ئەم پیاوە یارمەتی زەرقاوی دەدات کە سەربازگەیەکی تایبەت بەخۆی بکاتەوە.

لە ٢٠٠١/١٠/٧ کاتێ هێرشەکانی ئەمریکا بۆ سەر ڕژێمی تالیبان دەستپێددەکات، زەرقاوی بە سەختی قاچێکی بریندار دەبێ، لەوێوە بە برینداری لە ڕێگەی ئێرانەوە بۆ کوردستان (ناوچەی ژێر دەسەڵاتی انصار الاسلام) دێت، کاتێ لە ٢٠٠٣/٣/٢٣ هێزەکانی ئەمریکا بە هاوکاری پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك) هێرش دەکەنە سەر پێگە و پەناگەکانی (انصار الاسلام) نزیکەی (٥٧) لەو کۆمەڵەیە دەکوژرێن، کە هەندێکیان عەرەبی ئەفغانی هاوەڵی زەرقاوی بوون.

دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام حسین و لێدانی بارەگاکانی (انصار الاسلام) لە کوردستان هیچ شوێنێ لە بەردەم زەرقاویدا نەما ڕووی تێبکات، جگە لە ناوەڕاست کە بەسەختی دژایەتی هێزە ئەمریکییەکانیان دەکرد، لەوێ زەمینەیەکی بەپیتی بۆ پەرەپێدانی چالاکی دژ بەهێزە ئەمریکییەکان دۆزیەوە.

لە ٢٠٠٣/٣/٢٣ تاکو ٢٠٠٤/١٠/١٧ زەرقاوی لە ژێر ناوی (جماعة التوحيد والجهاد) چالاکی دژی هێزە ئەمریکییەکان و سەرکردە لە عێراقییەکان دەنواند، لە ٢٠٠٤/١٠/١٧ زەرقاوی لە بەیاننامەیەکدا خۆی وەك بەشێك لە ڕێکخراوی قاعیدە ناساند و (جماعة التوحيد والجهاد)ی بۆ (قاعدة الجهاد في بلاد الرافدين) گۆڕی. وەڵامی بن لادنیش لە سەر ئەو ڕاگەیاندنەی زەرقاوی زۆر دوانەکەوت، لە

کۆتایی مانگی کانونی یەکەم ٢٠٠٤ لە کاسێتێکی دەنگیدا پێشوازی لەو ڕاگەیاندنەی زەرقاوی کردو، وەك ئەمیری ڕێکخراوی قاعیدە لە عێراق دایمەزراند.
بیروڕاکانی (قاعدة الجهاد في بلاد الرافدين) لەو چوارچێوە فیکری و عەقیدەییەی کۆمەڵە جیهادی و تەکفیری و سەلەفییانەی دیکە دەرناچێت. لیژنەی شەرعی ڕێکخستنی (قاعدة الجهاد في بلاد الرافدين) بەم جۆرە بەیانی عەقیدەی خۆی دەکات: (شیعەکان رافیزەن، تایەفەیەکی شیرك و ڕەدەن. ئەگەر لە شوێن (وڵاتێك) دەسەڵات بەدەست کافرەوە بوو، ئەوا ئەو وڵاتە بەکوفر دادەنرێت)[1]. ڕێکخراوی (قاعدة الجهاد في بلاد الرافدين) لەم مێژووەی سەرەوە کاری توندوتیژی و تەقاندنەوە و چالاکی خۆکوژی و ڕفاندن لە عێراق ئەنجام دەدات، ناکریت لێرەدا ئاماری چالاکییەکانیان بکەین، ڕۆژانە ئەم ڕێکخراوە کاری توندوتیژی و چالاکی جۆراجۆر دژ بەهێزە ئەمریکییەکان و کەسایەتییە سیاسی و دامەزراوە عێراقییەکان و کەس و لایەن و ریکخراوە نێودەوڵەتییەکان دەکەن.

[1] الزرقاوي كما عرفه الاردنيون، جريدة القدس العربي الصادرة في ٢٠٠٤/٣/٥.